# نووسەری کورد

## گۆڤاری یەکێتیی نووسەرانی کورد

ژمـــارە (٧) ، خولی دووەم ، تەمووزی ١٩٨١

سەرۆکی نووسین

د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ

سکرتێری نووسین

موممتاز حەیدەری

بارەگای گۆڤـار

بغداد ـ الوزيرية

مقابل كلية التربية الرياضية • مقر جمعية الثقافة الكردية

چاپخانەی الحوادث..

# « الكاتــب الكــردي »

مجلة « نووسەری کورد »

مجلة اتحاد الادباء الاكراد في العراق

العدد (٧) ، الدورة الثــانية ، تموز ١٩٨١

رئيس التحريــر

الدكتــور عزالديــن مصطفى رســول

سكرتــير التحريــر

ممتــاز الحيــدري

الادارة

بغــداد ـ الوزيريــة

مقــابل كلية التربية الريــاضية

مقر جمعيــة الثقــافة الكرديــة

# THE KURDISH WRITER

BULLETIN OF
THE UNION OF THE KURDISH WRITERS IN IRAQ

No. ( 7 ) Second Period, July 1981

EDITOR — IN — CHIEF :
DR. IZZADIN MUSTAFA RASOOL

DEPUTY EDITOR — IN — CHIEF :
MUMTAZ HAYDARI

Office : BAGHDAD, WAZEERIYYAH, OPPOSITE COLLEGE
OF PHYSICAL EDUCATION, HEADQUARTERS OF
THE KURDISH CULTURAL SOCIETY .

## وتـــەی ژمارە

بخوێنی خۆشــەویست !

دیارە چاوەڕوانیتو تاسەی ژمارەیەکی تازەی ( نووسەری کورد ) دەکەیت • زۆر باش ئەوە دەزانینو وابزانین ئێمەش زۆر لە ئێوە زیاتر بە پەرۆشی ئەو بە یەکتر گەیشتنەوەوە بووین •

بەڵی ، وا ژمارەیەکی تریشمان دەرکـــرد ، هەموو ســـروشتی ژمارەکانی پێشوو لێرەدا دووبارە دەبێتەوە • دواکەوتنی ژمارە ، گرانیی نرخی ، بێتوانایی گەیشتنە قاڵبی ڕەنگینی تەکنیکی جوانی چاپکردن• بۆ ئەمانەش بەســەر وتاری ژمارەکانی پێشوودا بچنەوەو پێکەوە ، بڵێین ڕووی ئەو باری بێدەرامەتیو بێتـــوانایی‌یـــەی یەکێتی خـــۆیو باری چاپەمەنیی وڵات ڕەش بێت ، کە دەبێتە کۆسپ لە بەردەمی تاسەو ئاواتی هەردوولاماندا ، ئەگینا نە ئێمەی نووسەری کورد قەڵەمی بەکارو بەپیتمان لە نووسین کەوتووەو نە ئەو جەماوەری خوێندەوارو نەخوێندەوارەش کە بـە خوێندنـــەوەو بیستن وشەی پاکی ئێمــەی پـێدەگاتــەوە ، لــە خوێن‌گەرمیی قۆستنەوەی ووشەی دەروونی خۆی کەوتووە •

بەڵی •• چیمان وتووەو نووسیوە ، ســەر بە گەلو خواســتو ئاواتێتی ، دیمەنی ڕەشو سپیی ژیانێتی ، کڵپــەی تێکۆشـانێتی بە پەڕی

ڕەنگینی هونەرمەند کراوە بە وشەو تابلۆو دەچێتەوە ناو گەلو هەستی دەبزوێنێ ، ئەڤانیو توانای بەتین دەکات ، گڕی خەباتی خۆش دەکات ، بەرچاوی ڕوونو گەش دەکاتەوەو شانازیی بە ڕابوردووی خۆیو باوەڕی بە ئەمڕۆو دواڕۆژی بەتین‌تر دەکات •

جاروبار گلەییمان لێ دەکرێت ، (ڕاستەی) پێوانەی تایبەتی بۆ بڵاوکردنەوەمان دادەنرێت • نووسەری هەر ڕێبازە ئەدەبی‌یەو خاوەنی هەر چەشنە لێکدانەوەیە لەڕاستی خۆیەوە لە بڵاوکردنەوەی بابەتێک ناڕازی‌یە • بەڵام کەسیش نی‌یە لەناو بڵاوکراوەکانی نووسەری کورددا دەنگی دەروونو ویژدانو باوەڕی خۆی دوور ببینێو لەگەڵ چوارچێوەی گشتیی گۆڤارەکەدا نەبێت ، کەواتە گۆڤارەکە بووە بە دەنگی هەموو نووسەرانی دڵسۆزی کورد ، بە دەنگی خەڵکو خاکو نیشتمان • ئەمەش جێی شانازی‌یەو ڕێبازێکی ڕاستی لەگەڵ پلەی ژیانو نووسیندا گونجاوەو هەمیشە لە هەڵچوونی ئەم تاوو ئەو تاوی موناقەشەو ناکۆکیی ناسەرەکی بەدوورە ، زادەی بیرکردنەوەی ئاسۆی دوورو دوارۆژی گەلو مەسەلەی مرۆڤە •

هەرچی ئەم ژمارەیەیە ، ئەبوو لەپاڵ بابەتی هەمەڕەنگو جیاوازدا، دووابەشو بەرهەمی بڵاونەکراوەی مەهرەجانی دووەمی شیعرو یەکەم دیداری چیرۆکی کوردیی تێدا بڵاوبکرایەتەوە •

لە پاشماوەی میهرەجانی شیعر دوو پارچەمان بۆ هات کە ئەوەتەن بڵاومان کردوونەتەوە • لە بابەتەکانی دیداری چیرۆکیش تەنها دوو سێ بابەتمان بۆ هات ، بۆیە جارێ پرۆژەکەمان دواخست ، تا بەڵکو بابەتەکانی کەشمان بۆ بێتو هەمووی بەجاری لە ژمارەیەکی داهاتوودا بڵاوبکەینەوە •

**خوشك‌و برای بخوێن :**

ئەوە سێ ژمارەشە هەر کردوومانە بەعادەت کە باسێکی باری مان‌و نەمانی یەکێتیی نووسەرانی کورد بکەین • سەیر ئەوەیە کە هەرچی لە دوو ژمارەی پێشـــوودا دەربـارەی باری یەکێتــی‌و بێدەرامـــەتی‌و یارمەتی‌نەدان‌و چاوەڕێ‌بوونی هەڵوەشاندنەوە یا مانەوە نووسرا ، ئێستاش هەر وایە،ئەمەش شوێن‌پەنجەی بە هەموو باری دواکەوتن‌ و دەرنەچوونی گۆڤارەکەوە بەجێ‌هێشتووە •

لەناو دۆسی‌یەی کەرەسەکانی نووسەری کورددا زۆر بابەتی‌تری شایانی بڵاوکـــردنەوەماوە ، هیـــواداریـن یا لە بارێکی گونجـــاوتردا یا بەم حاڵەش بێت ، بتوانین ژمارەی‌تریش دەربکەین •

ئیتر لەگەڵ ئێوەدا هیواداریـن‌و تـوانای مەردانیش هەمووشتێـــکی لەباردایە •

**( ســەرنووســەر )**

لەوانەیە ڕام لەگەڵ ڕات یەك‌نەکەوێ ، بەڵام ئامادەم گیانی خـــۆم بۆ داکۆکی لە ئازادیی ڕادەربڕینت دانێم •

**ڤۆلتیر**

# له قوتابخانەی ( داستانی شێخ بەدرەدین ) دا
# سێ دەرزو دوو مامۆستا ..

**محمدی مەلا کریم**

بەلامەوە،یەکێ لەو شتانەی کارێکی ئەدەبی‌یان پێ ئەبێ بە ئەدەبێکی جیهانی‌و نەمر ، ئەوەیە ئەو کارە ئەدەبی‌یە لا بە لای ئەو شتانەدا بکاتەوە کە لە ژیانی مرۆڤایەتیدا نەمرن‌و هەرگیز لەبیرناچنەوە .. بۆیەش نەمرن‌و لەبیرناچنەوە ، چونکە لە هەموو کەسێکا نایەنەدی .. چونکە هەموو جارێ نایەنەدی .. ئەگینا ئەگەر لە هەموو کەسێکاو هەمیشە بهاتنایەتەدی ، هەم لە خۆیشیانا شتێکی عادەتی ئەبوون وەك نان‌و ئاو خواردنی ڕۆژانەی ئەم هەموو خەڵکەو ، هەم لەسەر ڕووی قاقەزیش هەواڵێکی عادەتی ئەبوون وەك ئەو هەموو هەواڵانەی ڕۆژانە لە ڕۆژنامەکانا ئەیانخوێنینەوە .

خۆ لەسەر بیروباوەڕی خۆ ـ ڕاگرتنی پیاو مەگەر بۆی دەرکەوێ بیروباوەڕەکەی چەوتە هەرچەند مەینەت‌و دەردی سەری زۆریشی لەپێناویا بێتە ڕێ‌و ، بە بەرچاو ڕوونی‌یەوەو بێ‌سڵ کردنەوە چاوەڕوانی کردنی ئەنجامی کاری خۆکردەو ، نەسڵەمینەوەو ورەبەرنەدان لەپاش ڕوودانی ئەو ئەنجامەو ، بەرابەر بە دوژمنیش بێ‌قانوونی نەکردن‌و

ژێرپێنەخستنی مافی ئەویش ، هەرچەند لەگەڵیشی ناحەزو ناکۆك بیو بەپێی داب‌و نەریتی دوژمنایەتی بتوانی هەموو شتێکی لەگەڵ بکەی ـ ئەمانە هەریەکە یەکێکن لەو کردارانەی مرۆیان پێ ئەبێ بە پیاوو ، تۆمارکردنیان ئەدەبی پێ ئەبێ بە شاکار ..

ئەم قسانە دەرزی دوو سێ برگەن لە ( داستانی شێخ بەدرەدینی کوڕی قازیی سیماونە ) ی ناظم حیکمەتی مەزن‌و نەمر ، کە دۆستی بەهرەمەندو مامۆستای باش بنووس‌و باش وەرگێڕم شوکور مستەفا کردوویە بە کوردی .

لە لایەکی ئەو داستانەدا کە باسی شێخ بەدرەدین ئەکا ، ئەڵێ :

« بۆ سوڵتان محەمەدیان هێنا لە سەرەز . دانشمەندێك تازە لە عەجەمستانەوە هاتبوو ، لە خزمەتی سوڵتاندا بوو ، مەولانا حەیدەریان پێ دەگوت . مەولانا حەیدەر گوتی : ئەمە بەشەرع کوشتنی حەڵاڵە ، بەڵام ماڵی حەرامە » .

من ئەمەم هەروا بەلاوە سووك‌و سادە نی‌یە .. مەولانا حەیدەر برای شا ئیسماعیلی سەفەوی‌یە .. لە بنەماڵەیەکی شێخانی تەریقەتن . شا ئیسماعیل بۆئەوەی حوکم بگرێتە دەست‌و بتوانێ بەرانبەر بە سوڵتانی عوسمانی ڕاوەستێ ، بیرئەکاتەوە ئەبێ شتێکی نوێ دابهێنێ ، دێ ڕێبازی ئایینیی خۆی ئەگۆڕێ ، لە سوننی‌یەتی‌یەوە ئەبێ بە شیعە مەزەب . مەولانا حەیدەری برای ، کە لەوەپاش ئەبێ بە باپیرە گەورەی بنەماڵەی زانست پەروەری حەیدەری‌یەکانی کوردستان ، قایل نابێ وەك براکەی بۆ ماڵ‌و پایەی دنیا لە ڕێبازی ئایینیی خۆی وەرچەرخێ .. قایلیش نابێ بۆ خۆی سەر کز کاو لە قەڵەمڕەوی برا لە ڕێ لاداوەکەیا بژی .. هەڵدێ پەنا ئەباتە بەر عوسمانی .

مەولانا حەیدەر مەلایەکی میوانی غەریبە ‧‧ لە کۆشکی سولتان دابەزیوە ‧‧ لەو سەردەمەدا شێخ بەدرەدینی بەدیل گیراو دێننە بەردەستی سولتان ‧ لێرەشدا مەولانا هەر مەلا موسوڵمانەکەی ئەوسای عەجەمستانە ‧ بیر لەوە ناکاتەوە ئەگەر سولتان گیانی شێخ بەدرەدینی بوێ دەری کێشێ، لەشکرەکەی چەپاوی ماڵی شێخ بەدرەدینو هەزاران شوێنکەوتووی شێخ بەدرەدینیان ئەوێ ‧‧ ئەو هەر حوکمی شەریعەت ئەزانێ لەم جۆرە بابەتانەدا ‧ حوکمی شەریعەتیش لە شوێنیوادا ئاشکرایە : شێخ بەدرەدین چونکە لە فەرمانی خەلیفە یاخی بوە ، خوێنی حەڵاڵە ، بەڵام بەر یاخیبوونەی لە دین دەرنەچوەو هێشتا هەر موسوڵمانە ‧ ماڵی موسوڵمانیش بۆ موسوڵمان حەرامە ‧ کەواتە ماڵی شێخ بەدرەدینیش بۆ سولتانو دەسو پێوەندی سولتان حەرامە ‧ بۆیە فتوای مەولانا بە حەڵاڵیی خوێنی شێخو حەرامیی ماڵی ئەبێ ‧

منو تۆ هەڵوێستمان بەرانبەر بە شەریعەتو حوکمی شەریعەتو بیروباوەڕی مەولانا حەیدەرو شێخ بەدرەدینو حوکمڕانیی سولتانی عوسمانی هەرچۆن بێ ، با بێ ‧‧ بەڵام من بەش بەحاڵی خۆم ، ناتوانم سەری ڕێز بۆ مەولانا حەیدەر نەوی نەکەم کە لە مامەڵەی لەگەڵ ناشەرعیکەرێکی وەك شێخ بەدرەدینا ـ بەپێی ڕێبازو بیروباوەڕی مەولانا هەر بەگوێرەی شەرع جووڵایەوەو ، لەوندە زیاتری دەرهەق بڕیار نەدا کەشەرع پێیوتبوو بڕیاری بدا ‧

لە دیمەنێکیتری داستانەکەدا ، چوار کەس لە باخێکا لەژێر سێبەری دار گوێزێکا دانیشتوون بحەسێنەوە ‧ شووتییان خستوەتە ناو ئاوی ساردەوە تا سارد بێو بیخۆن ‧ سیانیان مەلای مێزەر بەسەرو یەکێکیشیان

ئەفەندی‌یەکە • باس لە ( بوێر کلیجە ) ئەکەن کە یەکێکە لە پەیڕەوانی شێخ بەدرەدین • یەکێکیان ئەڵێ :

« ئەم سۆفی‌یە زۆر کەسی تێوروو کاوە • ئەمانیش بەدیارکەوتن چین • کردارو ڕەفتاریان بەپێچەوانەی شەریعەتی محەمەدی‌یە •• »

یەکێکی‌کەیشـــیان ئەڵێ :

« ــ پرسیار : ئەری بەڕاست ئەگەر بوێر کلیجە لەتوپەت کرا ، بەئیمانەوە دەمرێ ، بە بێ‌ئیمان دەمرێ ؟

« وەڵام : خودا بۆ خۆی دەزانێ • چون ئێمە لە حاڵی مردنی ئەو بێ‌ئاگاین •• »

بیهێننە بەرچاوی خۆتان •• ئا لەو ساڵانی سەدەکانی ناوەڕاستەدا•• لەو تاریکاییی حوکمی پاشکەوتن‌و دەرەبەگی‌و دەماری شێت‌گیری‌یەدا•• لە گەرمەی شەڕی خەلیفەی موسوڵمانان‌و سوڵتانی عوســــمانیدا لەگەڵ ڕاپەڕینێکی نیمچە سۆسیالیســـتی‌یانەی ، ئاڵای ئـاین هەڵگـرتووی ، جووتیاراندا ، کە ئەگەر سەرکەوتنی لە چارە بنووسرایە تەختو بەختی ئەوی تێك‌ئەدا •• کۆمەڵە مەلایەك ، کە وەك لە داستانەکەوە دەرئەکەوێ لە کەڵە مەلاکـانی دەرباری خەلافـەت بوون‌و ، پاڵپشـــتو بنەوانـەی ئایدیاییی خەلیفە بوون‌و حوکمـی بە فتـوای ئەوان‌و وەك ئەوانەکانەوە بەند بوە ، ئەوەندە بۆ بیروباوەڕی‌خۆیان دڵسۆزو لەگەڵ قەناعەتی خۆیان دەس‌پاك بوون‌و مەوزووعیەتیان ــ لە ســـنووری بیروباوەڕی خۆیـانـا ــ لەبیرنەکردوە ، ڕێیان بە خـــۆیان نـەداوە بوێر کلیجە بە بێ‌باوەڕ ناوبەرن •• وتوویانە : خوا خۆی ئاگای لە دڵی بەندەی هەیە ، بۆیە تۆ ئەتوانی بـەپێی شەرع فتـوای کوشتنی کـابرایـــەك بدەی لەسەر

بێشەرعی‌یەك •• بەڵام ناتوانی بە بێباوەڕی دانێی ، چونکە باوەڕ شتێکە لە دڵایەو ، دڵیش هەر خوا ئاگای لێیە چیی تیایە ••

ئای چەندی جیایە هەڵوێستی‌وا بەرزو مولتەزیمو لە هەمان کاتا بێلایەن •• لەگەڵ هەڵوێستی ئەو هەزاران بە درۆ موسوڵمان یا هاوچەرخو شارستانی‌یانە کە هەر ئەوەندە بە گۆشەی چاو ئیشارەتێکیان بۆ بکرێ یا لە سووچێکەوە چمکی سوودێکی تایبەتی‌یان بۆ دەرکەوێ ، بە ڕاستو چەپدا بڕیار ئەدەنو ناوو ناتۆرە لەمو لەو ئەنێنو، تەنانەت لەسەر سەرینی دوا سەعاتەکانی شەویش کە دنیا هەمووی کشو مات ئەبێ ، ئەوەیان بەبیردا نایەت لە خۆیان بپرسن چەند لەگەڵ خوای خۆیان ڕاستنو بۆ بیرو باوەڕی بەئیدیعایان ئەمیننو ، گوێ ڕایەڵی فەرمانی ئەونو لەم لانادەن •••

ئەمە لەبەری ئەوبەرەوە کە زوربەی ڕۆشنبیرانی ئەمڕۆی لەگەڵ نینو بەڵکو دژیشینیو ، منی بنووسی ئەم چەند دێڕە خۆیشم خۆم لەناوئەوانا ڕیز ئەکەم •

ئەی لای شێخ بەدرەدینەوە چۆن ؟

ئەوا مەجلیسی سوڵتان دیوانی دادگایە ••شێخ بەدرەدین گیراوە•• هێنراوە لە حوزووری سوڵتانا ڕاوەستێنراوە •• مەولانا حەیدەری لە عەجەمستانەوە پەناهندە ، فتوای حەڵاڵیی خوێنی ، بەڵام حەرامیی ماڵی داوە •• وەختی ئەوەیە شێخی موتەهەمیش داکۆکی لە خۆی بکا ••

« گوترا : خۆشت قسەیێ بکە

گوترا : حەسێوی بێخوایت بدە ••

بــەدرەدین :
لە کەمەرانەوە ڕوانی‌یە دەرێ
دەرەوە خۆرەکەی خۆش بوو
لك‌و پۆپی دارێکی لە حەوشــە ڕواو
مەڕمەڕ بە ئاوی خوڕ سواو
بەدرەدین بزەی هاتێ
قوولآیی چاوی بریقاوە
گوتی : مادامێ ئەم جارە بەزین
هەرچی بکەین ، بڵێین ، زیادە •
ئیتر بەتانیدا ناڕۆم •
مادام فەتوا بۆ ئێمەیە ، بیدەن با مۆرێکی پیا نێین ••• »

پیاو ئەبێ ئا وا بــێ ، وەك بەدرەدین •• بەدرەدین کە لــە ناخی کێشەکەدا ئەژی ، لە قانوونی کێشە گەیشتوە • کێشە کە گەیشتە ڕادەی ئەوپەڕی توندو تیژی ، ئیتر هەرچی شەرع‌و قانوونە تیا وەلائەخــرێ‌و تەنها دەسەڵات‌و کینەی سیاسی بڕیاری خۆی ئەدا••لەبەرئەوە داکۆکی دادی کەس نــاداو بەکەڵــکی هیچ نایــەت • پیاویش مادەم ڕێگــایەکی بەئارەزووی خۆی بۆ خۆی هەڵبژارد ، ئەبێ پێکەکە تا دواچۆڕ هەڵدا•• بەدرەدین ئەمجارە بەزیوە •• ئەبێ لەم ڕوانگــەیەوە بڕوانێتە هــەموو ڕوویەکی مەسەلەکە • بەڵام ئەو ئامانجەی بۆی تێکۆشـــاوە هەر ماوەو زیندوەو ئەشمێنێ •• جا کە جارێکی‌کە کەســـێکی‌کە هەڵکــەوت بۆی ڕاپەڕی‌یەوەو سەرکەوت ، ئەو لەجیاتیی ئەم وەڵامی ئەمیش‌و خۆیشــی‌و هەموو پێشینانی بەئاکام نەگەیشتوو ئەداتەوە •

لەم دیمەنانەدا دوو بەرەی جیامان دی • ئێمەی خوێندەوار لەوانەیە

هەندێکمان سەر بە بەرەیەکێو هەندێکی کەمان سەر بە بەرەکەی دی بین •• بەڵام منی سەر بە بەرەی بەدرەدین ، ئاشکرا ئەیڵێم ئەم چەند دێڕەم بۆ ئەوە نووسی ، لەگەڵ هاودەنگیو هاودەردیی تەواویشما لەگەڵ شێخی شەهید ، سەری قەدرو ڕێز بۆ مەولانا حەیدەرو مەلاکانی بن دارگوێزەکەیش دائەنەوێنم کە لە کۆڕی کێشەداو لەگەڵ سەرکەوتنی بەرەکەی خۆیشیانا ، ڕێبازی خۆیانیان لەبیرنەچوو و لەوەندە زیاتریان ناهەقی لەگەڵ ئەملا نەکرد کە ڕێبازەکەیان بە هەقی دانابوو بۆیان ••

تۆ ئەگەر لەسەر هەق بی ، ئەتوانی دەماری خۆت بگریو تووڕە نەبی • بەڵام ئەگەر بزانی لەسەر هەق نیتو بەهەڵەدا چووی ، لە قسەی تاڵو سوێر بەولاوە هیچت دەسگیر نابێ ڕای خۆتی پێ بسەپێنی •

**غاندی**

# زۆرانبازیی چینایەتی لە ( مەم‌وزین )دا

هیوا عومەر ئەحمەد

ئۆربیللی ئەڵێ :

« کاتێ باسی ئەو شاعیرو نوسەرانە ئەکەین ، کە لە گەلەوە نزیکن‌و بە گەل‌و جەماوەرەوە بەستراون ، یەکسەر سێ ناومان دێتەوە یاد ، ئەوانیش (فیردەوسی) ی ئێرانی‌و – ( رۆستافیللی ) ی جیۆرجیایی‌و (ئەحمەدی خانی)ی کوردن (١)، ئەو ئەحمەدی خانی‌یەی شاکارێکی وەکو – مەم‌و زین – ی بە هۆنراوە داڕشتووە ، وەکو پەنجەرەیەکی ئاوەڵا بۆ دڵ‌و دەروونی خۆی ڕەنگ‌و بۆیەکی تایبەتیی داوەتێ •

لە ( تحفه مظفریه )ی ئۆسکارماندا دوو بەیت‌و لە (مەمی ئاڵان)ی (چیرۆکنفیس)دا سێ بەیتی‌تر هەن بە ناوی –مەم‌و زین– ەوەن ، لە هەمان کارەسات ئەدوین،بەڵام وەکو تێکستەکەی (خانی) لە ڕووداوەکاندا قوڵ نەبوونەتەوەو یە ناخی پاڵەوانەکاندا دانەچوون‌و نەگەیشتوونەتە ئاستی ئەوەی خانی وەکو (کوردۆیێف) ئەڵێ :

« خانی ، ژیانی یەك‌بەیەکی کوردی بە شێوازێکی ئەنسیکلۆپیدیایی تێدا خستۆتەڕوو•بەڕاستی ژیانی گەلە دەربەدەرو هەژارو ژێردەستەکەی

تێدا دەرخستووە • بەئاشکرایی بیرو ئایدۆلۆجیی ڕامیاریو چینـــایەتیی خۆی تێدا دەربڕیوە • (٢)•

(مەمو زین)، شاکارە بەناوبانگەکەی (ئەحمەدی خانی)یە ، کە لــە تەمەنی چلوچوار ساڵیدا ، نزیکەی پێنج سەدە لەمەوبەر نوسیویەتیو ، تا ئەمڕۆش بە کارێکی ئەدەبی نایابو دانسقە دائەنرێ • بەجۆرێ باســی سروشتی کوردستانو کارەساتو پاڵەوانەکان ئەکات ، تابلۆکان زیندوو ئەبنەوەو بخوێنوا هەستئەکات کە لە (جەزیرەی بۆتان ) دانیشتووە • لەنزیکەوە لە پاڵەوانەکـــان ئەڕوانێ • هــــەروەها بەشـێك لە مێـــژووی نەتەوەی کوردی لەم تێکستە پاراوەدا پاراستووەو زۆر نەریـــتو بۆنەی دێرینی وەکو (نەورۆز)و زەماوەنــدی تێــدا باسکردووە • بە نــاخی پاڵەوانەکاندا شـــــۆڕبۆتەوەو بەوردی هەســــتو نەستو ســــۆزی یەکالاکردوونەتەوە • جگــە لەوەی بــە شــێوەیەکی ڕوونو ئاشـــکرا زۆرانبازیی نێوان چینەکانی کۆمەڵگای ئەوسای کوردی تێدا دەرخستووە• ئەوەی من لێرەدا مەبەستمە تێیداقووڵبمەوەو کەمێ شیبکەمەوە، بریتییە لە زۆرانبازیی چینایەتیی نێوان پاڵەوانەکانی ئــەم تراژیــدیایە • بۆ ئــەم مەبەستەش واباشترە کورتەیەکی ( مەمو زین ) بخەمە بەردەستی ئێوەی ئازیز ، تاکو لێدوانەکەمان ئاشکراتر دەربکەوێ •

**کورتەی مەمو زین :**

تێکستی مەموزین لەم بەشانەی خوارەوە پێكهاتووە :

١ ــ پێرستو سەرەتا : لێرەدا بەگشتی باســی ئەوینی ــ (مــەمو زین ) ئەکات • بەمجۆرە دەستپێئەکات (٣) :

ساقی بکە جامی ئاسمانی
ڕاحا وەکو ڕۆحی جاویدانی

دا ئەم بکرین دەماغی جان تەڕ
یەك لەحظە بە ڕاحی ڕۆحپەروەر

ساقی تۆ بڕێژە جامی مینا
ئاڤا کوو دکەت ضەمیر بینا

لە کۆتایی ئەم بەشەدا ئەڵێ :ـ « بەڵکو ڕەخنەگران بە نەرمی‌یەوە لەم گەشتەم بڕوانن • هەرچەندە ئەم‌کارەم تەواویش نەبێ ، بەڵام هــەر هێندەم پێ‌کراوەو بە جگەرگۆشەی خــۆمی ئەزانم ، زۆر لام ئـازیزە • نازیم کێشاوە ، لە چاوەدا جوانە • من باغەوان‌و ئەم کارەم باخچــەیە • هەرچەندە ئەگەر میوەو بەروبومی کاڵ‌و کرچی تێدا ببینرێ ، بەڵام باخی دڵ‌و گوڵزاری بیرو ناخمە (٤) » •

٢ ـ جەزیرەی بۆتان : لەوشوێنەدا ڕووباری (دیجلە) خۆی لە ئەستۆی شاخەکانی کوردستان ئەئاڵێنێ ، باسی میرنشینیی (بۆتان) ئەکات • باسی (میر زین‌الدین) ئەکات کە چەند جەربەزەو بەدەســتەڵات‌و خواپێداوو شۆڕەسوار بووەو چۆن ناوبانگی بە هەمـــوولایەکدا بڵاوبۆتەوەو دیوان‌و وەزیرانی هــەبووە • هەروەها باســـی ئەوە ئەکات میر دوو خوشکی جوان‌و شــۆخ‌و شــەنگ‌و فەرپووخ‌لیقای هەبووە ، گەورەکەیان کە ناوی (ستێ) بوو تەمەنی بیست ســاڵ ئەبوو بچووکەکەشیان ناوی (زین) ئەبێ •

٣ ـ نەورۆز : لێرەدا باسی نەریت‌و ڕێ‌وشوێن‌و لایەنی مێژوویی نەورۆز ئەکات • ستێ‌و زین لــە ڕۆژی پێش نــەورۆزدا بڕیارئەدەن ،

بەیانی جل‌وبەرگی کوڕانە لەبەربکەن‌و بچنە ناو خەڵکی‌یەوە ، تاکو هەریەکەیان دڵداری خۆی هەڵبژێرێ •

٤ - نهێنیی دوو کەنیزەک : لە هەمان کاتدا (تاژدین - تاج‌الدین)ی کوڕی وەزیری میرو (مەم)ی دیوانداری میر ، بڕیارئەدەن جل‌وبەرگی دوو کەنیزەک لەبەربکەن‌و بچنە ناو حەشاماتەکە تا دولبەری خۆیان هەڵبژێرن • لە نەورۆزدا میر ئەچێ بۆ ڕاو • ئەمە کاری ستێ‌و زین ئاسان‌ئەکاو لەگەڵ ( دوو کەنیزەك )ەکەدا یەك‌ئەبینن‌و شەیدای یەك ئەبن • ( مەم‌و تاژدین ) ئەبووریێنەوە ، ستێ‌و زین بۆئەوەی مەم‌و تاژدین دوایی لە نهێنی‌یان بگەن ، ئەنگوستیلەکانیان ئەکەنە پەنجەی ئەوانەوە •

(ستێ) ئەنگوستیلەی (تاژدین)و (زین) ئەنگوستیلەی (مەم) لە پەنجە ئەکات‌و ئەگەڕێنەوە ماڵەوە •

٥ - پیرێژن : ئەم دڵدارو دولبەرانە تا چەند ڕۆژێ، ئەحەپەسێن• وەکو شتێکیان لێ ونبووبێ ، بێ‌خولك‌و پەست‌و خەمبار ئەبن • تا پیرێژنێکی ناسیاوی ستێ‌و زین لە هۆی ئەم‌بارەیان ئەپرسێ • لە سەرەتادا لێی ئەشارنەوە ، بەڵام پاشان دڵیانی بۆ ئەکەنەوە • ئەویش بڕیارئەدات ، شار بگەڕێ تا دوو کەنیزەکەکە ئەدۆزێتەوەو نهێنی‌یەکەیان ئەزانێ • ئەچێت (ڕمڵ)ی بۆ لێ‌بدەن • (ڕمڵ) ئەڵێ کە ئەو دوو کەنیزەکە دوو شۆڕەسواری ناسراوی شارن •

٦ - حەکیم‌باشی : پیرێژن خۆی ئەکات بە حەکیم‌باشی‌و ماڵ‌بەماڵ ئەگەڕێ تا ڕێی ئەکەوێتە دیوەخانی باوکی تاژدین‌و بە تاژدین‌و مەم ئەگات • کە دڵی بۆ ئەکەنەوە ، پێ‌یان ئەڵێ کە ستێ‌و زین ناردوویانە •

٧ ـ خۆشەویستی : پیرێژن ئەچێتەوە بۆ لای ستیو زین ، ئەوانیش ئەینێرنەوە بۆلای کوڕەکان تا بێنە خوازبێنییان .

٨ ـ مزگێنی : گەورەپیاوانو ناسیاوانی باوکی تاژدین کۆئەبنەوە . خۆیان ئامادەئەکەن بۆ خوازبێنی . وا بڕیارئەدەن کە لەپێشەوە ستی بۆ تاژدین داوابکەن تا کاری مەموزین ئاسان ئەبێ .

٩ ـ زەماوەند : لەسەر ڕێو شوێنی کوردانە شاییو زەماوەندێکی چەند ڕۆژی ئەگێڕنو ستێ ئەگوێزنەوە . مەمیش ئەبێ بە برازاوا .

١٠ـ دووزمانی : میر دەرگاوانێکی بوودەڵەو دەبەنگی ئەبێ ناوی بەکر مەرگەوەڕ ئەبێ . تاژدین خۆشی لەم دەرگاوانە نایەت ، ئەویش چاوی بەم هەڵنایەت . زۆرجار هەوڵئەدات میر قایل بکات بەکر دەربکات . بەڵام بێهوودە ئەبێ . هەل بۆ مەرگەوەر هەڵئەکەوێو دووزمانی ئەکاو تاژدینو مەمو ستیو زین لە بەرچاوی میر ڕەشئەکات .

١١ـ لە ڕوانگەی پەژارەوە : بەشێوەیەکی ڕۆمانسی باسی خەمو پەژارەو ناڵەی جودایی‌و دابڕانی مەموزین ئەکات .

١٢ـ ئازارەکانی مەم .

١٣ـ ڕاوو شکار : میرو گەورەپیاوانی ئەچن بۆ ڕاو .

١٤ـ ژوان : زین دێتە ناو باغچەی کاروانسەراکەیانەوە . مەم لەبەر بێخولکی‌و بێئەوەی بزانێ ڕوو لەکوێ بکات ، بە ڕێکەوت لە بەردەم باغچەی میردا ئەگیرسێتەوە . ئەچێت کەمێ لە باغەکەدا

غەم بدا بە با بە زین ئەگات • دڵیان بۆ یەك ئەكەنەوە • پاشان ئەچنە هوڵەكەیانەوە ئاگایان لای كات نامێنێ ، لە ئەنگۆرەدا ، میرو پیاوەكانی لە ڕاوو شكار دێنەوە ، ئەچنە باغچەكە و دێنە هۆڵەكەوە• زین خۆی لەپشت مەمەوە ئەشارێتەوە • میر ئەپرسێ ئەوە كێیە؟ مەم ئەڵێ گوایە نەیتوانیوە لەگەڵیان بچێ بۆ راو • ئێستاش ئەگەر هێزی تێدا بوایەو بیتوانیایە لەبەریان هەڵئەسا •

١٥- ئەمەكداری : لە هۆڵەكەدا كۆڕ گەرمئەكەن • تاژدین بەهۆی ئاوگێڕانەوە دێتە لای مەم • كە كارسانەكە تێئەگات ، هیچی بەدەستەوە نامێنێجگە لەوەی دانیشتوان بە كارێكی كتوپریەوە خەریكبكات • ئەچێتە دەرەوە، ئاگر لە كۆشكە نایابەكەی بەرئەدات • هەواڵ ئەنێرێ بۆ میرو دانیشتوان ، ئەمانیش دێن بەهاواریەوە • بوار بۆ زین پەیدائەبێ بگەڕێتەوە بۆ كۆشكەكەی خۆیو مەمیش ئەچێت بۆ ئاگر كوژاندنەوە •

١٦- دووزمانی : بەكر مەرگەوەڕ كەدەنگوباسی ئەم ژوانە ئەبیسێ ، زۆری پێوە ئەنێو بۆ میری ئەگێڕێتەوە • میریش ئەڵێ گەر درۆبكات لەسەری‌ئەدات • ئەمیش بۆ سەلماندنی دووزمانی‌یەكەی ڕێوشوێنێ بۆ میر دائەنی كە مەم بانگ‌بكات بۆ شەترەنج كردن • گەر دۆڕاندی یان بردیەوە داوای لێبكات كە بڵێ حەز لە كێ ئەكات • با لە دەمی خۆیەوە ببیستێ چۆن بە بێ‌ئابڕوویی ناوی زین دێنێ •

هەرچۆنی بێ بەكر وا لە مەم ئەكات بە میری بدۆڕێنێ • میریش داوای لێ ئەكات ناوی دولبەرەكەی پێ بڵێ • ئەو قسە ناكات ،

مـەرگەوەڕ بە فێڵێك ناچـاری ئەكـات ناوی زین بهێنێ • مـیر فەرمان ئـەدات لە سەری مـەم بدەن ، بـەڵام تـاژدین‌و بـراكانی فریائەكەون‌و ناهێـڵن لە سـەری بـدرێ‌و بڕیارەكەی پێ ئەگۆڕن بەبەندی تاكومردن‌و لە قولەیەكی سەختدا بەتەنیا بەند ئەكرێ •

١٧ـ پاكبوونەوەی گیان : مەم لە بەندیخانەدا ئەبێ بە سۆفی •

١٨ـ نائومێدی : كە مەم بەندئەكرێ ، زین لە ژیان نائومێد ئەبێ •

١٩ـ شۆڕش : تاژدین‌و براكانی‌و ناسیاوانی مەم زۆر هەوڵ‌ئەدەن كـە میر لە مەم خۆش‌بێ‌و ئازادی بكات • بەڵام بێهوودە ئەبێ • پاشان ناچار ئەبن خۆیان كۆبكەنەوەو بچن بۆ دواجار ڕیش‌سپی‌یەك بنێرن بۆ لای میر • ئـەگەر لێی خۆش‌نەبوو ، ئـەوا ئەچن بەزۆر لـە قولەكەی دەرئەهێنن •

٢٠ـ فریو : میر بە زمانی خۆش ڕیش‌سپی‌یەكە بەڕێ‌ئەكاو پەیمانـی ئەداتێ كە مـەم دەربهێنێ‌و زینی بداتێ • بـەكر مەرگەوەر خۆی قیت‌ئەكاتەوە • وا ڕێ‌وشوێن بۆ میر دائەنێ كە زین بنێرێت بـۆ لای مەم • بەمە مەم لەخۆشی‌یاندا شاگەشكە ئەبێ‌و ئەمرێ • ئەوسا تاژدین‌و براكانی ژەهرخواردوو بكات •

٢١ـ پەشیمانی : میر ئەچێ سەر لە زینی خوشكی بدات • كە بە كەساسی‌و لاوازی‌و نەخۆشی ئەیبینێ ، پەشیمان ئەبێتەوە • زین قوڵپێ خوێن ئەكۆكێ‌و لەهۆش خۆی ئەچێ • ستێ دێت بەسەردا ، وائەزانێ كە میر كوشتوویەتی • بـەڵام كە ڕاستی تێ‌ئـەگات ، لەگەڵ مـیرو

خەڵکی‌تردا بەدیار زینەوە ئەمێننەوە تا دێتەوە هۆش خۆی • میر پەیمانی ئەداتێ کە بیدات بە مەمو پەشیمانیی بۆ دەرئەبڕێ • زین ئەڵێ کە مردنی نزیکەو ڕاسپاردە ئەکات ئەگەر مرد لەگەڵ مەم لە یەك گۆڕدا بینێژن • بەکریش لای قاچیانەوە بنێژن •

٢٢ـ دواژوان : زین ئەڕازێننەوە • ئەچن مەم لە زیندان دەربهێنن • بەڵام مەم بووە بە سۆفی ، کەمێ قسەیان بۆ ئەکاو گیانی ئەسپێرێ ، شار ئەشێوێ• دەنگ‌وباس بە تاژدین ئەگات • کە دێت بۆ لای مەم لە ڕێدا مەرگەوەر ئەبینێ ، سەری ئەپەڕێنێ • وەکو شێت‌و هار بەدوای میردا ئەگەڕێ ، تۆڵەی مەمو زینی لێ بکاتەوە • پیاوەکانی میر ئەیگرن• زین بە کۆست‌کەوتوویی لەگەڵ ستێدا ئەگەڕێتەوە ماڵـەوە •

٢٣ـ کۆتایی : بۆ ڕۆژی دوایی ، حەشاماتێکی زۆر بەرەو گۆڕستان ئەچن ، مەم بنێژن • زین خۆی ئەدا بەسەر گۆڕەکەداو پاش کەمێ گیانی دەرئەچێ • لەسەر ڕاسپاردەی خۆی گـۆڕەکەی مەم هەڵئەدەنەوەو پێکەوە ئەیاننێژن‌و بەکر مەرگەوەریش لەلای قاچیانەوە ئەنێژن •

خانی بەوە کۆتاییی تراژیدیاکە ئەهێنێ کە ئەڵێ :

« سەیر ئەوەیە ، هەر گوڵ‌و گوڵزار لەسەر گورەکەی مەم‌و زین سەوزئەبێ‌و دڕك‌وداڵ لەسـەر گۆڕەکـەی بـەکر مەرگەوەڕ ئەڕوێ » •

٢٤ـ خانی ڕێ‌وشوێنی ئایین‌داری‌و خواناسین بە مرۆ نیشان‌ئەدات •

٢٥ـ دەمەقاڵە لەگەڵ خامەدا . لێرەدا وەکو مامۆستا گیو ناوی‌ناوە ، دەمەقاڵەیەکی خەست‌و خۆڵ لەنێوان خانی‌و خامەکەی‌دا ڕووئەدات. لەکۆتایی‌دا خانی باسی ساڵی لەدایك‌بوونی خۆی ئەکات :

**لەوڕا کو دەما ژ غەیب فەك بوو**
**تەئریخ هەزارو شێستو یەك بوو**

هەروەها ، باسی ئەوە ئەکات کە لە تەمەنی ( چل‌و چوار ) ساڵی‌دا ( مەم‌وزین )ی داناوە :

**ئیسال گەهیشتە چهل‌وچاران**
**وی پیشڕەوی گوناهکاران**

**لێکۆڵینەوە :**

بۆئەوەی زۆرانبازیی چینایەتی لە کۆمەڵگایەك‌دا سەرهەڵبدات ، ئەبێ ( کۆمەڵەکە لە چەند چینێك پێك‌هاتبێ . بەرژەوەندی چینەکان پێکەوە هەڵنەکا ) (٥) .

بەپێی دابەشکردنی ئابووری‌و هۆکانی بەرهەم‌هێنان ، دوو چینی سەرەکی لە کۆمەڵگای ( مەم‌وزین )دا ئەبینین :

١ ـ چینی‌چەوسێنەوە ، چینی سەرەوە : کە میرو وەزیرەکانی‌و فەرمانبەرە بەرزەکان‌و کەس‌وکاریان ئەگرێتەوە . کە لەسایەی ئەمان‌دان‌و لەگەڵیان‌دا هاوبەرژەوەندی‌و هاوچارەنووسن .

٢ ـ چینی چەوساوە ، چینی ژێرەوە : کە ڕەش‌وڕووتی ناوکۆمەڵ‌و وردە فەرمانبەری وەکوو مەمی دیوان‌دارو بەکری دەرگاوان ئەگرێتەوە . هەندێ لە پاڵەوانەکانی ئەم تراژیدیایە ، لە تەوەرەی

زۆرانبــازیی چینایەتیــدان ئەمەش بــەوەی هەســت بە جیاوازی‌یە چینایەتی‌یەکە ئەکەن‌و لەوە هۆشــیارن کە بەرژەوەندی‌یان لەگەڵ بەرژەوەندی چینەکەی بەرامبەریان ناگونجێ‌و لە زۆرانبازی‌دایە • ئەگەر بەوردی بە دەروون‌و ناخی هەر پاڵەوانەدا شۆڕ ببینەوەو لــە هەڵس‌وکــەوت‌و بەرژەوەندی‌یــان ووردبینــەوە ، ئــەوەمــان بۆدەرئەکەوێ کــە بەپێی بەرژەوەنــدو هەڵس‌وکــەوت‌و حــەزو ژانەکانیان دوو چینی دژبەیەك پێك‌ئەهێنن •

یەکەم : چینی چەوسێنەوەی سەرەوە : کە بریتی‌یە لە میرو وەزیرو گەورە فەرمانبەرو بەکرمەرگەوەرِی دەرگاوان • هەرچەندە بەکر بەپێی ریزبەندی‌یەکەی سەرەوە ، سەر بــە چینی ژێــرەوە دامان‌نا ، بــەلاَم کابرایەکی تێك‌شــکاو ، ویژدان مــردوو ، دووزمــان ، ئاژاوەچی‌یەو بەرژەوەندی خۆی بە مانەوەی چینی سەرەوە گرێ‌داوە • هەردەم لــە کۆشش‌دایە کەمێك لــە میر نزیکتر بێتــەوە • ئەکەوێتــە ئاژاوەنانەوەو دووزمانی کردن‌و دووبەرەکی خستنە نێوان خێزان‌و ناسیاوانی میر بۆئەوەی بەسەر پەیژەی ناکۆکی‌یەکەدا سەربکەوێ‌و جێگەیەکی نزیکتر بۆ خۆی داگیر بکاو لەوێوە بتوانێ رق‌و کینەی خۆی زیاتر بە خەڵکی برِێژێ • بۆئەمەش زیرەکانە، بەجۆرێ دووزمانی‌یەکە ئەکات ، لە ژێی هەستیاریی میر بداو کەرامەتی بریندار بکات ، تا ئەمە وا بیشڵەژێنێ ، لەئاستی هەموو راستی‌یەك کوێری بکاو گومان لە دڵسۆزی‌و داوێن‌پاکیی نزیکترین‌و دڵسۆزترین کەسی بکات (٦) •

ئەو لەم هەوڵ‌و کۆششانەی‌دا هەردەم دڵسۆزی چەوسێنەرەوەو دوژمن‌و ناحەزی مرۆڤی خێرخوازو زۆرلێ‌کراوە • هەردەم بەرگری بۆ مانەوەی دەستەلاَتی میری چەوسێنەرەوە ئەکات ، چونکە ئەزانێ سەرەنجامی بــە

سەرەنجامی میرەوە بەستراوە • هەر ئەوەندە نا بەڵکو ئەم کۆیلە ئەڵقە بە گوێیە جگە لەوەی هەوڵی نەئەدا هەست بە نۆکەرێتییەکەی بکاو کۆششی نەئەکرد لەپێناوی ئازادیی خۆیدا ، بەڵکو هەوڵیئەدا کەوا بە خۆیو خەڵکی بسەلمێنێ کە ئەم نۆکەرێتییە مایەی شانازییەو هیچ نەبێ خۆی شانازیی پێوە ئەکردو ناوی نابوو دڵسۆزی بۆ میر • سەیر کەن چی بە میر ئەڵێ :

گۆ قەنجە حەقیقەتا هومامان
هەمسەنگی صەداقەتا خولامان

رۆژا قە دخۆن شەرابی بەلوا
گاڤا کو دخۆن کەبابی سەلوا

چاوا نە د شاهیو صەفایی
ئەورەنگ د تەنگیو جەفایی

عاریض نەبتن لەوان تەبەددول
ظاهیر نەبتن ژ وان تەحەوول

مەحضەن نەکەن ئەو قوصووری خیدمەت
قەطعەن نەکەن ئەو فوتووری هیمەت

ئەڤ ذەوقو جەفا بین موقابیل
ئەو صیدقو وەفا بین موعادیل

لێ ضائیعە هیممەتا کەریمان
دەرحەققی نەلائیقو لەئیمان

وەکو وتراوە : «کەس لۆمەی کۆیلە ناکات لەبەرئەوەی بە کۆیلەیی لەدایکئەبێ ، بەڵام ئەو کۆیلەیەی هەوڵی ئازادیی خۆی نەداو بیانوو بۆ

کۆیلەیەتی‌یەکەی ئەهێنێتەوەو بەرگێکی ئاڵاو واڵای بەبەردا ئەکات ، دەبەنگ‌و زۆڵەو شایانی هیچ نی‌یە ئەوپەڕی گاڵتەپێ‌کردن‌و بێ‌و قێز لێ‌کردنەوە نەبێ »(٨) .

میریش قەیسەرێکی بچووك بوو بۆخۆی . ژمارەیەکی زۆر چەکداری بۆ پاس‌کردنی مانەوەی خۆی ڕاگرتبوو . زۆر خێڵ‌و تیرەی خستبووە ژێر دەستەڵاتی خۆی . جگە لەوەی دەرەبەگێك بوو زۆر جۆر سەرانەو باجی ئەسەند . هەروەها بە ناوی دیاری‌یەوە خەڵکی ڕەش‌و ڕووتی ئەڕووتاندەوە . هەر لەبەر ئەمە کۆمەڵێك سوارچاکی ئەڵقەلەگوێی لە خۆی کۆکردبووەوەو ڕێزی ئەگرتن بەوەی ڕاستەوخۆ لە بەرژەوەندی نەئەدان ، تاکو میرێتی‌یەکەی بۆ بپارێزن‌و هەموو بزووتنەوەیەکی بۆ سەرکوت بکەن‌و ئاگری هەموو جوڵەیەکی بۆ دامرکێننەوە (٩) .

لای ئەم چینە ئافرەت وەك ئەنگلز ئەڵێ : ( ژن بێ یان خوشك یان دۆت ) بە شتێکی وەکو کەل‌وپەلی بەرهەم هێنان‌دائەنرێ ، لەبەرئەمە ژن‌و ژن‌خوازی بە پلەو پایەی ئابووری‌یەوە گرێ‌ئەدەن‌و زۆر بەدەگمەن ئەبینرێ ژن‌هێنان‌و شووکردن بەپێی حەزی هەردوولا بێ یان بڵێین بە سەربەستی جێ‌بەجێ بکرێ (١٠) .

لەبەرئەمەیە کە میر بە ژن‌و مێردایەتیی ئاژدین‌و ستێ قایل ئەبێ ، چونکە جگە لەوەی کە ئاژدین سەر بە چینی سەرەوەیە ، هەروەها سوود لە سوارچاکی‌و هێزو کەس‌و کاری وەرئەگرێ بۆ هێشتنەوەی دەستەڵاتی خۆی ، بۆیە لە خۆی نزیك‌ئەکاتەوە . بەڵام شتێکی ئاسایی‌یە کە ڕێ لە ژن‌و مێردایەتیی زین‌و مەم بگرێ . نەك هەر ئەوەندە بەڵکو بە تاوانێکی گەورەشی دابنێ ، چونکە جگە لەوەی کە مەمی وردە فەرمانبەر

سەر بە چینی خوارەوەیە ، هەروەها هیچ سوودێکی وایشی تێدا نابینێ کەوا لە میر بکات زینی بـداتێ ، تـا بەهـۆی ئەوەوە بتوانێ سوودەکانی لێ دابدۆشێ •

دووەم : چینی چەوساوەی ژێـرەوە : ئەمەش خەلـکی ڕەش‌و ڕووت‌و وردە فـەرمانبەری وەکـو مەم‌و زیـنی خوشـکی میرو تاژدین ئەگرێتەوە •

هەرچەندە تاژدین کوڕە وەزیرەو بەمە ئەبوایە لەگەڵ چینی سەرەوەدا ناومان ببردایە ، بەڵام بە دڵ‌و دەروون‌و هەڵس‌و کەوت‌و حەزو خولیاو ژانەکانی لەگەڵ چینی خوارەوەدایە • سەیرکە چۆن ئەبێ بە دەستەبرایەکی زۆر نزیك‌و خۆشەویستی فەرمانبەرێکی بچووکی وەکو مەم •

لەپێناوی ئابڕووی مەمدا کۆشکە بەناوبانگە نایابەکەی خۆی ئەسووتێنێ • بەگژ میرو پیاوەکانی‌دا ئەچێ تاکۆ مەم لە دەست مردن ڕزگار بکات • شۆڕشێك بەرپا ئەکات تاکو مەم لە زیندان دەربهێنێ •

لەئەنجامیش‌دا لەتاو مردنی مەم شێت‌و هار ئەبێ • لەسەری بەکـر مەرگەوەڕ ئەدات • بەدوای میری ژن‌برای‌دا ئەگەڕێ تا بیکوژێ‌و تۆڵەی مەمی لێ بکاتەوە •

(خانی) زۆر بە شارەزاییەوە ، هەر لەوکاتەوە زینمان پێ ئەناسێنێ ، بەشێوەیەك پیشانی ئەدات کە بە هەڵس‌وکەوت‌و بیرکردنەوە سـەر بـە چینی خوارەوە بێ • کاتێ ستێی خوشکی باسی هەڵبژاردنی هاوسەری بۆ ئەکات ، وا بیری ئەڕوات کە لەنێو ئەندامانی چینی سەرەوەدا بەدوای ئەو هاوسەرە ئەندیشەییەدا بگەڕێ ، بەڵام زین‌وا پێشنیار ئەکات ، کـە لە ڕۆژی (نەورۆز)دا، کە هەموو خەڵك بە دەوڵەمەندو هەژارو نێرو مێ‌و

گەورەو بچووکەوە تێکەڵ ئەبن بۆ ئاهەنگ گێڕان ، ئەمان جل‌وبەرگی کوڕانە لەبەربکەن‌و تێکەڵ بە گەل بن‌و بەدوای ئەو هاوسەرەدا بگەڕێن کە ئەچێتە دڵیانەوە ، (زین) بە (ستێ) ئەڵێ : « ئەزانی بەیانی نەورۆزەو هەموو دانیشتوانی (جەزیرە) ئەڕژێنە ئەو سەوزەبارو مێرگانە • بێ‌گومان ئەمە جوانترین‌هەلە بۆئەوەی بیری لێ ئەکەینەوە »(١١) • لێرەدا زین پلەو پایەو میرێتیی خۆی‌و براکەی بە چەپەرێ دانانێ ، کە لە خەڵـکی ڕەش‌و ڕووتی جیا بکاتەوە• بەوپەڕی قایل‌بوونەوە ، لەناو گەل‌دا بەدوای دڵداری خوی‌دا بگەڕێ • هەرکەسێکی بچێتە دڵەوە ، هەژار بێ یـــان زەنگین ، مـێردی پێ بـکات • هەروەها کاتێـك (پیرێژن) ئەنێرن بۆ سـۆراخی کەنیزەکـەکان ، ئەوەی لـێ ناکەن بە مـەرج کە تەنیا ماڵە گەورەکان بگەڕێ ، بەڵکو داوای لێ ئەکەن لە هەر کوێ‌یەك بێ‌و لە هەر ماڵێك بێ سۆراخی دڵداریان بۆ بکات •

کاکە مەم پیرێژن ڕائەسپێرێ کە بە زین بڵێ دڵدارەکەی هەژارو کەم‌دەست‌و ڕەش‌وڕووتە • ئایا بەوجۆرە شووی پێ ئەکات •

زین لە وەڵامدا ئەڵێ : «لەجیاتیی شیربایی‌و پارەو سامان ، ئـەو خۆشەویستی‌یەمان بەســە ، کـە لە یەکـەم ڕۆژەوە دڵـی خستووینەتە خورپە • ئەو دڵسۆزی‌یەمان بەسە کە لێمان دین »(١٢) •

کە مەم ئەم وەڵامـەی پێ‌ئـەگات ، لەبەرئـەوەی لـە جیاوازی‌یە چینایەتی‌یەکە هوشیارە ، خەم‌و پەژارە دایئەگرێ ، چونکە ئەزانێ ئەمە ئەبێتـە کۆسپێك لەنێـوان خـۆی‌و زیـن‌داو خۆشەویسـتی‌یەکەیـــان جوانەمەرگ ئەکات •

هەروەهاش تاژدین کە لەم جیاوازی‌یە ئاگادارە ، خەم‌و پەژارە بۆ مەمی دەستەبرای دایئەگرێ‌و سەری دنیای لێ دێتەوە یەك •

زین هەموو نـازو خـۆشیو کۆشكو تەلارو خواپێداوی‌یەکی مێرنشینی‌یەکەی لێ ئەبێتە کۆتو زنجیرو ئەچنە دەستوپێ‌یەوە • زین ئەڵێ (١٣) :

**ئەیوان ل مە بوویە داری میحنەت**
**زیندان ب مە بوویە باغی جەننەت**

**خۆزیا کو ل من غەضەب کرا میر**
**مانەندی مەمێ بە غیلل‌و زەنجیر**

**ئەز ژی بشهاندما وی چالی**
**ڕۆژەك ڤەکەتا ل من ژ سالی**

**جارەك بدیا من ئەو گرفتار**
**دەرمان بکرا من ئەو بریندار**

**عومرێ من ئەگەرچی یەك ڕەمەق بوو**
**حەققا کو مرن ژ بوو مە حەق بوو**

مەمی چەوساوە کە نەیتوانی سەرەڕای خۆگرتن‌و هەوڵ‌و کۆشش بە ئاواتەکانی بگات ، لەنائومێدی‌و بێهیوایی‌دا توایەوە ، ڕووی بەرەو ئاسمان وەرچەرخاندو بە دەروازەیەکی زانی بۆ قوتاربوونی لە چنگ (نامۆیی‌و لانەوازی‌و نائومێدی) (١٤) و بووە سۆفی •

دوا بەڵگەمان ڕاسپاردەکەی زینە کە تێیدا ئەڵێ (١٥) :

**حەتتا ڤە کە سالەکی تەمامی**
**هەندی کو تەلەف دکی طەعامی**

**هەندی کو ب دەرد دی لیباسان**
**هەندی ڤە دخوونی عام‌و خاصان**

هەندی کو بکر دکی قوماشان
هەندی کو بەلاف دکی مەعاشان

هەر رووژ ب نیەتا غەزایێ
هەندی کو گەلەك دکی عەطایێ

هەندی وەکو توو ل تەختێ رۆنی
هەر رۆژ توو جندیان ڤە خۆنی

هەندی کو تەهی دکی خەزینان
هەندی وەکو شاد کی حەزینان

هەندی کو غەنی دکی فەقیران
هەندی کو رەها دکی ئەسیران

هەندی د حوکوومەتێ خەبەر دەی
هەندی وەکو گرتیان تو بەردەی

هەرچی کو ژ بو خوەرا دکی خەرج
هەرچی د خەزینیان دکی دەرج

تا ئەگاتە ئەوە کە ئەڵێ :

دەرحەققی منو مەمێ نکی عار
گاڤا دمرت مەمێ بریندار

ئەز دی بە جەنازەیێ وی ڕا بم
حەتتا ڤە کە مەقبەران تەبا بم

وەقتی دمرم بدی تو دەستوور
دا من بکرن دگەل وی مەستوور

من ژا لێ وی دەربەر نەگیری
بێپەردە دگەل ئەوی ڤەشیری

## دوا وتـــه :

که باسی ( مەم‌و زین ) ئەکرێ ، یەکسەر بەیتە دڵداری‌یەکانمان دێتەوە یاد ، ( خەج‌و سیامەند ، لاس‌و خەزال ، وەلی‌و شەم ، شیرین‌و فەرهاد ، ئەستی‌و فـەرخ)ی کـوردی ، ( مجنون لیـلی)ی عـەرەبی‌و (ڕۆمیۆو جولێت)ی ئینگلیزی‌و (پۆل‌و فەرجینی)ی فەرەنسەیی ، کـە هەموویان باسی نائومێدبوونی دڵدارو دولبەرێکی بۆیەك‌سووتاو ئەکەن • له کوردی‌یەکاندا ، (خەج‌و سیامەند)ی لێ دەربکەی ، هیچیان وەکـو ( مەم‌و زین ) کێشەیەکی گرنـگ ناخەنـەڕوو بەڵـکو نائومێدبوون‌و لێك‌دابڕانەکەیـان لەئەنجامی ناکـۆکیی کۆمەلایەتـی‌و بریـنداربوونی کەرامەتەوە بووە • بەلام ئەم بەیەك‌نەگەیشتنە له (مەم‌و زین)و (خەج‌و سیامەند)دا ئەنجامی برینداربوونی (کەرامـەت)و جیـاوازیی چینایەتی بووە • من نەنگیم نی‌یە لەوەی کە ( بەکر مەرگـەوەڕ ) بۆتـە نمونەی دووزمانی‌و فیتنەیی‌و چەپەڵـی‌و ئاژاوەچێتی‌و چەندان پەنـدی لەسـەر خـولقاوە ، بەلام لام‌وایـە کە هۆیەکی زۆرگرنگ‌تر له دووزمانی‌یەکەی بەکر له بەیتی مەم‌و زین‌دا هەیە ، کە بووە هۆی‌لێك‌دابڕانی زین‌و مەم ، ئەویش جیاوازی‌یە چینایەتی‌یەکەیە • ئەگەر (میر) خۆی ئامادە نەبوایە بۆئەوەی مەم بەو دەردە بەرێ‌و زینی خوشکی نەداتێ ، هەرگیز وەکو بەنزین گـڕی نەئەگرت‌و قسـەکانی بەکری نەئەکـرد بە بیانوویەك • ئەمەشمان لە چەند خاڵێکەوە بۆ دەرئەکەوێ •

١ ـ بەکر دووزمـانیی بۆ ستێ‌و تاژدینیش کـرد ، بـەلام میر لەگـەڵ ئەماندا نەکەوتە زۆرانبـازی •

٢ ـ میر بە چاکی بەکری ئەناسی کە چەند ناکەس‌بەچەو ئاژاوەچی‌و دووزمانە ، بەلام بە قسەکانیشی هەڵخلیسکا •

٣ ـ له خەج و سیامەندو بەیتەکانی تردا ، بەکر مەرگەوەڕ نی یە • بەڵام دڵدارو دولبەرەکە نائومێد ئەبن • ئەمیش لەبەرئەوەی کە هۆ گرنگترەکەیان تێدایە کە جیاوازی یە چینایەتی یەکەیە •

کەواتە بەکر مەرگەوەر ئەو ڕۆڵە برووخێنەی نەئەبوو ئەگەر میر بەپێی پێویستی ڕەوشتە دەرەبەگی یانەکەی،، لە بیانوویەك نەگەڕایە بۆئەوەی خاتوو زینی خوشکی نەدا بە مەم و بەو دەردە سەختەی ببا •

**پەراوێزەکـان**

١ ـ لاپەڕە (٨)ی کتێبی :

احمد الخانی،شاعرا ومفکرا،متصوفا وفیلسوفه د٠عزالدین مصطفی رسول ، بغـداد ، ١٩٧٩ •

٢ ـ هەمان سـەرچاوە ، لاپەڕە (٩) •

٣ ـ لاپەڕە (٣٩)ی کتێبی :
(مەم و زین) ی ئەحمەدی خانی ، گیوی موکریانی ، چاپی سێ هەمین هەولێر ، ١٩٦٨ •

٤ ـ لاپەڕە (١٢)ی کتێبی :
مم وزین ، احمد الخانی ، ترجمة : محمد سعید رمضـان البوطی ، بیروت ، ١٩٥٨ •

٥ ـ لاپەڕە (٦٢)ی کتێبی :
حول نظریة صراع الطبقات ، جورج بلیخانوف ، ترجمة : جـورج طرابیشـی ، بیروت ، ١٩٧٥ •

٦ ـ لاپەڕە (٦١)ی کتێبی :

تكنولوجيا السلوك الانسانى ـب•ف ـ سكينر ، ترجمة : د• عبدالقادر يوسف ، بيروت ، ١٩٨٠ •

٧ ـ سەرچاوەی سێهەم ، لاپەڕە (٩١) •

٨ ـ لاپەڕە (٨٤)ی کتێبی :

ملحمة الشيخ بدرالدين ، ناظم حكمت ، ترجمة : **فاضل لقمان** ، دار الفارابى ، ١٩٧٩ •

٩ ـ لاپەڕە (٦١)ی کتێبی :

حول مسألة الاقطاع بين الاكراد ، أ• شاميلوف ، ترجمة : د• كمال مظهر احمد ، بغداد ، ١٩٧٧ •

١٠ـ لاپەڕە (٧٥)ی کتێبی :

المرأة فى التراث الاشتراكى ، انجلز ، ترجمة : جورج طرابيشى ، بيروت ، ١٩٧٧ •

١١ـ سەرچاوەی چوارەم ، لاپەڕە (١٩) •

١٢ـ سەرچاوەی پێشوو ، لاپەڕە (٥٧) •

١٣ـ سەرچاوەی سێهەم ، لاپەڕە (١٣٥) •

١٤ـ لاپەڕە (٧٠)ی کتێبی :

مذاهب ومفاهيم في الفلسفة والاجتماع ، تأليف ـ د• عبدالرزاق مسلم الماجد ، صيدا ـ بيروت ، ١٩٧٧ •

١٥ـ سەرچاوەی سێهەم ، لاپەڕە (١٥١)

# هەندێ شیعرو گۆرانیی میللیی فەڕەنسەیی

**عەزیز گەردی**

**لە فەرەنسەیی‌یەوە کردوویە بە کوردی**

**١ ـ ئاسکی سپی**

ئەوانەی وا دەچنە لێڕ
دایكو کیژن •
دایکە بە ڕێوە گۆرانی دەڵێو
کیژەش هەناسەی سارد هەڵدەکێشێ •

ـ « مارگرێت ، کیژم !
بۆ هەناسەی سارد هەڵدەکێشی ؟ »

ـ « ڕقێکی زۆر گەورەم لە دەروونایەو
ناوێرم بۆتی بدرکێنم ـ
بە ڕۆژ کیژمو
بە شەو ئاسکی سپیم ؟
ڕاوکەر بەدوامەوەن :
بەگو شازادەو (رونۆ)ی برایشم
ئەو لە هەموویان خراپترە •

بڕۆ ، دایە ! بڕۆ ،
خێرا پێی بڵێ
تا سبەی دانی ئێواری
تاژی‌یە‌کانی بگرێتەوە . »

ــ « رونۆ ، کوا تاژی‌یە‌کانت ؟
کوا نێچیری نازدارت ؟ »

. « وان لەناو لێڕدا
ئاسکی سپی ڕاو دەنێن . »

ــ « بیانگرەوە ، رونۆ !
تکات لێ دەکەم بیانگرەوە ! »
سێ جار فووی لە زوڕنا سفرەکەی کرد
جاری سێ‌یەم
ئاسکی سپی وەگیر کەوت .

. « با بنێرین قەساب بێ ؟
ئاسکەکە کەوڵ بکات . »
ئەوەی کەوڵی دەکا ، دەڵێ :
« نازانم بڵێم چــی ،
ئەم ئاسکە تووکی سپــەو
سنگ‌و بەرۆکی کچانی پێوەیە . »
کێردی دەرکێشاو شەقو پیلی کرد .
کردیانە زیافەت ،
بۆ بەگ‌و شازادان .

تەنیا مارگرێتی خوشکم دیار نی‌یە • »

ـ « دەست بە خواردنی خۆتان بکەن ،
من پێش هەمووتان لێرەم ؟
سەرم وا لەناو لەنگەری‌دایە ،
دڵم بە قولابەوە هەڵواسراوە ،
خوێنم بە سەراپای ناندین‌دا پژاوە ،
ئێسکی کلۆلیشم وا لەسەر
ڕەژوو هەڵدەقرچێ • »

**٢ ـ دوازدە مانگی ساڵ**

یەکەم مانگی ساڵ ،
چ بدەمە خۆشەویستەکەم ؟
کەوێك ،
کە بێ ، کە بڕوا ، کە بفڕێ •
کەوێك ،
کە بەناو ئەم دارستانەدا بفڕێ •

دووەم مانگی ساڵ ،
چ بدەمە خۆشەویستەکەم ؟
دوو قومری ،
کەوێك ، هتد •••

سێیەم مانگی ساڵ ،
چ بدەمە خۆشەویستەکەم ؟

سێ مشکی ناو داران ، (۱)
دوو قومری ، هتد ...

چوارەم مانگی ساڵ ،
چ بدەمە خۆشەویستەکەم ؟
چوار مراوی بەحەواوە ،
سێ مشکی ناو داران ، هتد ...

پێنجەم مانگی ساڵ ،
چ بدەمە خۆشەویستەکەم ؟
پێنج کەروێشك کە زەوی هەڵبدڕن ،
چوار مراوی بەحەواوە ، هتد ...

شەشەم مانگی ساڵ ،
چ بدەمە خۆشەویستەکەم ؟
شەش کەروێشکی دەشتێ ،
پێنج کەروێشك کە زەوی هەڵبدڕن ، هتد ...

حەوتەم مانگی ساڵ ،
چ بدەمە خۆشەویستەکەم ؟
حەوت سەگی لەغار ،
شەش کەروێشکی دەشتێ ، هتد ...

(۱) لە هەندێ چاپدا نووسراوە :
« سێ کۆترە باریکەی ناو داران »

هەشتەم مانگی ساڵ ،
چ بدەمە خۆشەویستەکەم ؟
هەشت بەرانی سپی ،
حەوت سەگی لەغار ، هتد ...

نۆیەم مانــگی ساڵ ،
چ بدەمە خۆشەویستەکەم ؟
نۆ گای بە شاخەوە ،
هەشت بەرانی سپی ، هتد ...

دەیەم مانگی ساڵ ،
چ بدەمە خۆشەویستەکەم ؟
دە مریشکە کورك ،
نۆ گای بە شاخەوە ، هتد ...

یازدەم مانگی ساڵ ،
چ بدەمە خۆشەویستەکەم ؟
یازدە کەڵەشێری لەبانگدان ،
دە مریشکە کورك ، هتد ...

دوازدەم مانگی ساڵ ،
چ بدەمە خۆشەویستەکەم ؟
دوازدە ئەسپی بە زینەوە ،
یازدە کەڵەشێری لەبانگدان ،

ده مریشکه کورك ،
نۆ گای به شاخه‌وه ،
هه‌شت به‌رانی سپی ،
حه‌وت سه‌گی له‌غار ،
شه‌ش که‌رویٚشکی ده‌شتیٚ ،
پیٚنج که‌رویٚشك که زه‌وی هه‌ڵبدڕن ،
چوار مراوی به‌حه‌واوه ،
سیٚ مشکی ناو داران
دوو قومری ،
که‌ویٚــك ،
که بیٚ ، که بڕوا ، که بفڕیٚ ،
که‌ویٚــك ،
که به ناو ئه‌م دارستانه‌دا بفڕیٚ •

**٣ – ( ڕونۆ )ی ئافره‌تکوژ**

(ڕونۆ) ئه‌وه‌نده کۆك بوو
دڵی له کچی پاشا سه‌ند
بردی حه‌وت قۆناغ دووری‌خسته‌وه
بیٚ ئه‌وه‌ی یه‌ك دوو قسه‌ی له‌گه‌ڵ بکات

که گه‌یشتنه نیوه‌ی ڕیٚگا :
« به‌خوا ، رونۆ ، زۆر برسیم ! »
« نازدار ، ده‌ستی خۆت بخۆ ،
چونکه جاریٚکی‌تر نانت به ده‌م ناکه‌ویٚ • »

که هاتن ، گەیشتنە قەراغ دارستان :
« بەخوا ، رونۆ ، زۆر تینووم ! »
« نازدار ، خوێنی خۆت بنۆشە ،
چونکە جارێکیتر شەراب ناخۆیتەوە • »

« گۆمێك لەو خوارەیە .
کە چوونە نزیك گۆمەکە
سێزدە کچی تێدا خنکاوە
سێزدە کچی تێدا خنکاوە

تۆش دەبی بە چواردەمین • »
کە چوونە نزیك گۆمەکە
داوای لێ کرد خۆی رووت کاتەوە •
« کاری سوارچاکان نییە ،
کچان بە ڕووتی ببینن »

« شیرەکەت بخە ژێر پێت ،
پاڵتۆکەت بخە سەر دەموچاوت »
شیرەکەی خستە ژێر پێو
پاڵتۆکەی خستە سەر دەموچاوی

کچە ، گرتی ، ماچی کرد ،
فڕێیدا ناو گۆمەکەوە ،
« وەرن مارماسینە ، وەرن ماسینە !
گۆشتی ئەم دزە بخۆن • »

رونو هەوڵی دا
خۆی بە پرچێك بگرێتەوە
كچە شیرەكەی هەڵكێشاو
پرچەكەی بڕی •

« نازدار دەستی خۆتم بدەرێ
سبەینێ دەتخوازم »
« نقوم بە ، رونۆ نقوم بە ناو گۆمێ
ئەو كچانە بخوازە كە وان لەوێ • »

« نازدار ، ئەگەر لێرە جێم بێڵی
كێ دەتباتەوە »
« ئەسپی كەوێتی تۆ
خۆی ملی رێگا دەگرێ • »

نازدار ، دایكو باوكت چ دەڵێن ،
ئەگەر ببینن دەزگیرانت لەگەڵدا نی یە » •
« پێ یان دەڵێم كە تۆ دەتەویست چیم لێ بكەی ،
من وام لێ كردی • »

## ٤ ــ مێردكردنی كچە فەرەنسەییەك بە كوڕێكی ئینگلیز

**تۆش هەروەهای ، ئەی ولاتەكەم !**

كچی پاشای فەرەنسا بوو
كە دایانە ئینگلیزێك •

« هۆ ، برا شیرینەکانم ،
لێمەگەڕێن ، بمبەن !
سەربازی فەڕەنسەییم
زۆر لە پاشای ئینگلیز خۆشتر دەوێ • »

کە هاتن بیبەن ،
دەبوو بەناو پاریس‌دا تێپەڕێ :
کچ نەبوو لە پاریس
بۆی نەگری ،
کە دیتیان پاشای ئینگلیز
کچی پاشایان دەبا ،

کە هاتن بچنە ناو کەشتی
ویستی چاوی ببەستێتەوە •
« چاوی خۆت ببەستەوە ، لە هیی من گەڕێ •
هەی ئینگلیزی نەگریس !
مادام دەچمە ناو دەریاوە ،
دەمەوێ تێر تەماشای بکەم ! »

کە هاتن لە دەریاوە بچنە سەر وشکانی ،
لە هەمولایەکەوە دەهۆڵو زوڕنا بوو :
« بکشێنەوە ، هۆ دەهۆڵەنگیوینە ،
زۆڕنا ژەنینە !
ئەمە دەنگی دووزەلەی پاشای فەڕەنسە نی‌یە • »

که هاتن ئێواره شێو بخۆن ،
ویستی نانی بۆ کەرت بکا :
« بۆ خۆت کەرتی کە ، نەك بۆ من .
هەی ئینگلیزی نەگریس !
کە تۆ دەبینم
نە نانم پێ دەخورێو نە ئاوم پێ دەخورێتەوە . »

که هاتن شەو پاڵبدەنەوە ،
ئینگلیزەکە ویستی گۆرەوی‌یەکانی کچە داکەنێ :
« گۆرەوی‌یەکانی خۆت داکەنە ، لە هیی من گەڕێ .
هەی ئینگلیزی نەگریس !
لە وڵاتی خۆما زۆر کەسم هەیە ،
خزمەتم بکات . »

کە بووە نیوەشەو ،
کچە هەر نەنووست :
« خۆت وەرگێڕە ، بمگرە ئامێز ،
ئینگلیزەکەی نازدارم
مادام خوا بە نسیبی یەکتری کردووین .
دەبێ یەکدیمان خۆش بوێ . » ★

★ بۆی هەیە ئەم گۆرانی‌یە فۆلکلۆری‌یە لەبارەی (هێنریێتا)ی فەرەنسا بێ کە دایانە چارلزی یەکەم .

# گوڵە ژاکاوەکانو ٠٠٠ چاوەڕوانی

رەئووف حسەن

**دەڵێن :**

لە بەرەبەیانێکی هاوینی ساڵی ١٩٥٨دا کیژۆڵەیێکی شۆخو نازدار بە باوەشێ گوڵی ڕەنگاوڕەنگەوە لە بەردەمی مزگەوتی گەورەدا بینراوە گوڵو زەردەخەنەی بەناو کرێکارەکانی ئەو گوزەرەدا بەخشیوەتەوە ٠

**دەڵێن :**

چوار هاوینی تریش لە هەمان بەرەبەیانو هەمان شوێندا کرێکارەکان چاوەڕوانیان کردوەو لەگەڵ شۆخە نازدارەکەدا یەکتری یان گوڵباران کردوە ٠٠

دوای ئەوە ئیتر ئەو بێسەروشوێن بووەو ٠٠ ئەمانیش گیرۆدەی زەردەخەنەو کۆشە گوڵی بوونو وێڵی سۆراخی ٠

**هەروەها دەڵێن :**

لە بەرەبەیانێکی بەهاری ١٩٧٠دا جارێکیتر ، کیژۆڵە شۆخو دڵفڕێنەکە بە چەپکە نێرگزەوە هاتۆتەوەو نێرگزبارانی کردوون ٠٠

چوار بەهاریتریش کۆشە نێرگزی لە گوندەکانەوە کردۆتە

دیاریی دەستیو لە هەمان گوزەردا لەگەڵ زەردەخەنە نازدارەکەیدا گوڵبارانی کردوون •

دوای ئەوە ئیتر ئەو بێسەرُوشوێن بوەو ئەمانیش گیرۆدەی زەردەخەنەو نێرگزو وێڵی سۆراخی بوون •

**دەشیان وت :**

لە هەردوو جاردا کیژۆڵەکە هێندە سرك بوو ئاهی دڵی گوزەرەگەی نەشکاند •

**دەڵێن :**

ئیمامی مزگەوتی گەورەش •• دوا بەدوای نوێژی بەیانی •• بە ئەهلی جەماعەتی ڕاگەیاند کە :

ئەو ئافرەتەی لەم شارەدا شوێنی نەدۆزیوەتەوە چاوباشقەڵی تێدا بکات ، بەردەمی ئەم مزگەوتە نەبێ ، ئافرەتێکی غەیرەدینەو تا خۆتان دوورەپەرێز بگرن لێی ئیمانتان قایمتر دەبێ •

بەڵام کرێکارەکان دوای جەماعەت بەتاڵ بوون بە پەلە بۆ چاوەڕوانیی کارکردنو بینینی کیژۆڵە نازدارەکە لەو گوزەرەدا کۆبوونەوە •

لەم ڕۆژانەشدا قاو بڵاوە کە لە بەرەبەیانێکی تۆفو شوومی ئەمساڵیشدا •• لە هەمان شوێن •• ئافرەتێکی ڕەقەڵەی باڵابەرز •• بە بێ کۆشە گوڵو بە لێوبەباری‌یەوەو بە نهێنی بینراوە •• پارچە پارچە جلەکانی داکەندووە •• بەبێ شەرم •• تا ڕووتو قووت بۆتەوە •• جێ‌زامو قەتماغەی برینەکانی سەر سینگو پشت ڕانی نیشانی کرێکارەکان داوە •• قژە زاکاوو دەسکەنە کراوەکەیشی نیشان‌داون •

دەڵێن : هەر ئەو بەیانیە بە ئەهلی جەماعەت ڕاگەیێنراوە کە :

ئەو ئافرەتەی لە بەردەمی ئەم مزگەوتەدا خۆی ڕووت کردۆتەوە.. سۆزانی‌یە هاتوە لە دینێ وەرمانبگێڕێ .. کە لە قاپیی مزگەوت چوونە دەرەوە لەگەڵ شەیتاندا بەلەعنەتی کەنو سەری خۆتان داخەنو ئاوڕی لێ مەدەنەوە .. هەر کەسێکیش ناوی بردو باسی کرد ئەویش بەلەعنەت کەنو سڵاواتی خۆتان بدەنو بڵێن :

خوایە لە شەڕی شەیتانو بەڵای ناگەهانو فیتنەی ئاخر زەمان بەدوورمان خەیت ..

دەڵێن یەکی لە کرێکارە نوێژکەرەکان زۆری پەلە بوو ، بەر لەوەی بڵێ (ئامین) وتی :

ئێمە لەو گوزەرەدا چاوەڕوانیی کار دەکەین .. چی‌بکەین ؟ نەچینە کارکردن ؟!

دەڵێن کرێکارێکی‌تریشیان پەلەی بوو .. بەر لەوەی بڵێ (ئامین) وتی :

مامۆستا .. من یەکەمین جار بینیم وام دەزانی پەری‌یێکی ئاسمانی‌یە لە لایەن خواوە نێرراوە ..

هەر ئەوەندە وەڵام‌درانەوە :

ئێمە هەر ئەوەندەمان لەسەرە .. ئەمەی تووشمان بوە فیتنەی ئاخر زەمانە .. ئیتر گوناهی خۆتان لە ئەستۆی خۆتان‌دایە ..

دەڵێن : بەر لەوەی جەماعەت بەتاڵ بێ .. کرێکارە نوێژکەرەکان

به پەلە خۆیان گەیاندە لای کرێکارە نوێژ نەکەرەکانو لەو گوزەرەدا خڕبوونەوە •

هەموویان بە ماتەمینیو قوڕگی گیراوەوە سەرنجی سەرو قژی ژاکاوو جێزامو لەشە شینو مۆر هەڵگەڕاوەکەیان دەدا •

کرێکارەکان بە چرپە لەناو خۆیاندا دەیانوت :

جێزامەکان ڕەنگو بۆی گوڵاڵەو نێرگزو زەردەخەنەیان گرتووە ••

هەندێکیشیان دەیانوت :

ئەم ڕەقەڵە باڵابەرزە هەر کیژۆڵە نازدارو شەنگەکەی جارانە ••

**بەدزیەوە دەڵێن :**

ئەو شەوە کە کرێکارەکان بەماندوێتی گەڕانەوە ماڵەوە •• هەرچییەکیان بەچاوی خۆیان دیبوو بۆ ژنەکانیان گێڕایەوە •• ژنەکانیشیان بە چاوی فرمێسکاوییەوە بە بێدەنگ گوێیان گرتووە •• ئەمجا بەر لەوەی چراکان کز بکەن خۆیان بۆ مێردەکانیان ڕووت کردۆتەوە • کاتێ بە وردی لە لەشو لاری ژنەکانیان ورد بوونەتەوە •• لەشو لاری ئافرەتە ڕەقەڵە باڵا بەرزەکەیان تیایاندا بینیوە •

**دەڵێن :**

کرێکارەکان بۆ ساڕێژکردنی برینو ئازارەکان باوەشیان بۆ لەشی شینو مۆر هەڵگەڕاوی ژنەکانیان کردۆتەوەو لە ئامێزیان گرتوون••ئەمجا

پێکەوە لە تیشکی چراکانیاندا کۆرپەیێکی نازداریان بینیوە ، پێدەکەنیو دەشنێتەوە ..

**دەڵێن :**

بۆ بەیانی کاتێ لەو گوزەرەدا کۆبوونەوە .. بە نهێنی بۆ یەکتریان گێڕایەوە .. هەمووشیان سوێندیان خوارد کە ئەو کۆرپەیەی لە تیشکی چراکەیاندا بینیویانە هەر وەك ئەو کیژۆڵە شۆخو نازدارە بوو کە چەپکە گوڵو چەپکە نێرگزو زەردەخەنەی بەسەردا دەبەخشینەوە .

ئێستاش کرێکاران هەموو ڕۆژێ بەرەبەیان .. دەستە دەستە ڕوودەکەنە هەمان گوزەرو چاوەڕوانیی کیژۆڵە شۆخو نازدارەکەو کۆشەگوڵو زەردەخەنەی دەکەن .

**کانوونی یێکەمی ١٩٧٩**

**تێبینی :**

ئەم چیرۆکە لە میهرەجانی ڕۆشنبیریی کوردیدا ڕۆژی ٢٢ی نیسانی ١٩٨٠ لە هەولێر خوێندرایەوە .

# هەندێ ڕەخنەی لای ئێمەو

# دەردی بە یەك چاو بۆ بابەت ڕوانین

**ئەنوەر قادر محەمەد**

**جەژنی ژیانو سالانی لاویم**
**من لە کۆششی سەختا بەسەربرد**
**هەر شاعیرێکی ئازادیخواش بووم**
**هیچ ڕێگەیەکی‌ترم قەت نەگرت**

**« نیکراسۆف »**

لە ژمارە (٦)ی گۆڤاری ( نووسەری کورد )دا کاك ڕەئووف عوسمان وتارێکی دەربارەی هۆنراوەی « چۆن کپ ئەبم ! » نووسیوە . ڕاستی‌یەکەی ئەگەر وتارەکەی هەر لایەنی هونەریی شیعرەکەمی بگرتایەتەوەو تەنانەت ئەگەر لە رووی فیکریشەوە ڕێنمایی بکردمایە ، دەستی‌بگرتمایە بۆ سەر ڕێی ڕاستو گومانی لە دڵسۆزی‌و هەڵوێستم نەکردایە ، بەدەنگ نەئەهاتم . بەڵام کاك ڕەئووف لەهەندێ شوێنی وتارەکەیدا ، ڕاستەوخۆ ئەیەوێ وا لە بخوێنان بگەیەنێ کە من نامەوێ هاوبەشی لە خەباتی ئازادیخوازیی میللەتەکەمدا بکەم، کە ئاشکراشە ئەمە وا نی‌یەو لەم ڕێگەیەدا بەگوێرەی توانام درێغیم نەکردووەو ، ئەگەر بەرژەوەندی نیشتمان هاتبێتە پێشەوە هینی خۆمم خستۆتە ژێر پێ ..

بەڵام من نایەم لە ڕەخنەگر بپرسم کەی ڕۆژێ لە ڕۆژان لەسەر مەسەلەی نیشتمانپەروەری لە گوڵ کاڵتر بە ئەو وتراوەو ، کەی بە حەیاتی ١٠٠ مەتر لە وەزیفەو ماڵ دوورکەوتۆتەوەو ، لەپێناوی ئەم مەسەلەیەدا ئەو چاردو گەرمی‌یەکی ژیانی دیوە ؟! هەرچەندیش مرۆڤ کە داوای هەڵوێستێك لە یەکێکی‌تر ئەکات ، ئەبێ پێشەکی ئەوەی لەبیر بێت کە ئەو شتەی لە خەڵکی داوا ئەکات خۆی کردوویەتی یان نە، ئەگینا بە چ‌هەقێ داوای لە خەڵکی ئەکات ؟!

هەر لەم دەرفەتەدا ئەمەوێ دوو سێ قسە دەربارەی ئەم جۆرە ڕەخنانە بکەمو ، دوایی بێمەوە سەر وتارەکەی ڕەخنەگر ٠

هەندێ لە برادەرە ڕەخنەگرەکانی لای ئێمە خۆیان بە میراتگرو هەقداری پێشکەوتنخوازی ئەزانن‌و لایان‌وایە ئەگەر نووسینێك ئەوان مۆرەکەی پێدا نەنێن ، ئیتر ئەوە هیچ نی‌یەو ئەدەبی میللەت نی‌یە ٠ من لام‌وایەو لاوابوونەکەشم لە مێشکی خۆم دەرنەهێناوە مەسەلەی هونەر بەم گەزە کورتانە ناپێورێت ٠ لەم یەکێتیی سۆڤیەتەدا کە وڵاتی هاتنەدیی یەکەم خەونی مرۆڤایەتی‌یە ، وڵاتی « گۆرکی »ی باوکی ڕیالیزمی سۆشیالیستی‌یە ، هەموو ڕۆژێ بەلێشاو کتێب لە دەزگا زانستی‌یەکانەوە دەربارەی زانستی جوانناسی‌و تیۆریای ئەدەب‌و ڕەخنەی سۆشیالیستی‌یانە دێتە بازاڕ ، من قەت خۆم وا نیشان‌نادەم کە بە دوو ساڵ‌و نیو دەوری ئەو هەموو کتێبەم کردۆتەوەو لەوسەریەوە هاتوومەتەوە ٠ بەڵام ئەوەندەی تواناو کاتیش مۆڵەتی دابم ، درێغیم نەکردوە ٠٠ ئەو کتێبانە لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ باو بڕی ئەدەبی ڕۆژاوایان لە مێشکمدا سڕیوەتەوە ، زوربەی بۆچوون‌و قەناعەتەکانی جارانیشمیان پتەوتر کردوەو زیاتر چەسپاندوە ٠ بۆیە دیسانەوە ئەیڵێمەوە کە هونەر بەم خەتی چەپ‌و ڕاست‌و

دوو سێ قسەی وەك « شاكارە »و « هیچ نی‌یە»و « پێشكەوتنخوازانەیە »و « كۆنەپەرستانەیە » شی‌ناكریتەوەو هەڵناسەنگێنرێت • مایاكۆفسكی شاعیری شۆڕش بوو ، كەچی لینین شیعری پووشكینی لە هی ئەو خۆشتر ئەویست • لینین لەگەڵ سەمفۆنیاكانی بیتهۆفندا ئەتوایەوە •• تۆ بڵێی هەست‌و نەستی ئەویش بۆرژوازی‌یانە بووبێت ؟ ئایا ئەو برادەرانە لە گوێ‌لێ‌گرتنی پارچەیەك مۆسیقا ، لە تێ‌ڕوانینی تابلۆیەكدا كە جوانی‌و شیرینیی سروشت‌و ژیان دەربڕێ‌و زوربەی خەڵكیش پێ‌یان خۆش بێ، چی‌ئەڵێن ؟! من باوەڕم بەوە هەیە كەسەرجەم سەیری هونەر بكرێت لە بەرژەوەندی چینە جیاجیاكانی كۆمەڵەوە هەڵئەقوڵێت • بەڵام حیسابێكی تایبەتییشی هەیەكە بەم زائیدو ناقیسەی ئەوجۆرە ڕەخنەگرانەی لای ئێمە چارەسەر ناكرێت • هەر ئەو « گۆركی »یە هەڵكەوتووە ، سەردەمێكی زۆری ژیانی لەناو پارتیدا بەسەرنەبردوە • خۆی ئەڵێ : « من لەنزیك پارتی‌یەوە ئەوەستم » • كەسێكیش نی‌یە لەم وڵاتەدا تێڵ لەم ڕستەیەی بكاتەوە • بەپێچەوانەوە ، نەك لە كتێبە مێژووییەكاندا ، بەڵكو لە كتێبی ئەدەبی پۆلە ئامادەیی‌یەكانیشدا نووسراوە • خۆ من دژی ئەوەش نیم كە هونەرمەند بلیتی لە گیرفاندا بێ ، بەڵام ئایا گۆركی كە لە پارتیدا كاری نەكرد ، ئیتر ئەدەبەكەی پووچ ئەبێتەوەو بایەخی نامێنێ ، یان چۆن ؟

ئەو برادەرە ڕەخنەگرانە ، هەرچەندە جاروبار تەوازوعێك ئەنوێنن ، بەڵام نووسینەكانیان بەپێچەوانەوەیەتی • ئەوان ئەبێ ئەوە بزانن هەرچەندە هوشیاریی سیاسی بنكەیەكی سەرەكی‌یە بۆ هەڵسەنگاندن‌و نرخاندن ، بەڵام بە بێ‌ڕۆشنبیری‌یەكی بەربڵاوو قووڵی تیووریای ئەدەب‌و جوانی ناسی ، ناتوانرێت ڕەخنە لەسەر ئەدەب بنووسرێت • خۆ هەزاریەكێكی ئەو كتێبانەی لەم مەیدانەدا نووسراون ،

نەکراونەتە عەرەبی • ئەی ئیتر بۆچی ئەبێ ئەو برایانە لایانوابێ هەرچی ئەوان وتیان « نرخەکەی شاعەباسە » ••• مرۆڤی زاناو مەوزووعی هەمیشە دوور لە فیزو لەخۆبایی‌بوون ئەبێ‌و هەڵوێستی خۆشی لە لا شاهەڵوێست‌و کەس‌نەکردە نابێ • هەرچی مەسەلەی خەڵکی خاوەن بەهرە کەوتنە بەر تیرو تانووت‌و قسەو قسەلۆکیشە، ئەوە هەر بە سەرێنیی ئێمەو ئەدەبی ئێمە نەبوە • مایاکۆڤسکی‌یەك کە ئەڵێ : « دوودڵیی ئەوەی بچمە پاڵ شۆڕش یان نەچم، نە بۆ من‌و نە بۆ هیچ‌یەکێ لە فۆتۆریستەکانی مۆسکۆ لەئارادا نەبوو • شۆڕش شۆڕشی خۆمەو چووم بۆ ( سمۆلنی ) بۆ کارکردن » (١)• ئەو مایاکۆڤسکی‌یەی کە تەنانەت پۆستەری بە شیعرو وێنە بۆ مەڕو مالاّتی کۆڵخۆزیش دروست ئەکرد،لای هەندێ‌کەس هیچی لەبارا نەبوو ، بە بۆرژوازی مەشرەب‌و دژ بە شۆڕش ئەدرایە قەلەم • هەر لەم‌بوارەدا لایەنێکی زەق‌و سەیری ئەم جۆرە رەخنانەی لای ئێمە هەیە ئەمەوێ ڕایەکی دەربارە بڵێم :

زۆر جار باس لە شتی‌وا ئەکرێت وەك ئەوەی نابێ شیعر بۆ ئافرەت‌و خۆشەویستی بنووسرێت‌و ئەمە نێرگسی‌یەتەو لەم بابەتە شتانە • من لەو برادەرانە ئەپرسم لەم‌ڕووەوە ئەوان چەندێ لەگەڵ هەست‌و ئارەزووی ڕۆژانەی خۆیاندا ڕاست‌ئەکەن ؟! دوای ئەوە ئەم بیرکردنەوەو هەڵوێستەی ئەوان لەوە ئەچێ کە باوەڕیان وابێ هەژار نابێ بیر لە خۆشەویستیی ئافرەت‌و چێژوەرگرتن لە جوانیی سروشت بکاتەوە ، چونکە بە خەیاڵی ئەوان ئەمە موڵك‌و پاوەنی قەدەغەکراوی بۆرژوازیەتەو لە ڕەوە ئەسپی ئارەزووی بۆرژوازیەت زیاتر نابێ هیی هەژار بکەوێتە

(١) مایاکۆڤسکی : من خۆم «بیرەوەری» ، شیعرو داستانەکانی ، مۆسکۆ ، ١٩٧١ ، ل ٢٠ ( بە ڕووسی ) •

ئەم باوەنە •• بۆ هەژار دڵی نی‌یە ؟ هـەیەتی‌و دڵێـکی زۆر گەورەش • هەروەها ئەمەوێ ئەوەش بڵێم « پووشکین » شـاعیرە خۆشەویستەکەی لێنین ، نەوەدو نۆ کچە هاوڕێی هەبوەو زوربەی شـیعرەکانیشی باسـی خۆشەویستی‌و دڵداری‌یە •• ئەو پووشـکینە گـەورەیەی کە شـاعیرو ڕخنەگری بەناوبانگی سۆڤیەتی أ • تڤاردۆفسـکی لەبارەیەوە ئەڵێـت : « کۆمەڵی کۆمۆنیزم بە بێ‌پووشکین لە جەوهەردا ناتەواو ئەبوو » (٢) • ڕەنگە ئەمە زۆر بەدەمەوە دانێکی تێدا بێت ، بەڵام هەر مەزنی‌و شـکۆی پووشکین دەرئەخـات • لەگـەڵ ئەوەشدا پووشـکین هـەر لە هـەرەتی لاوی‌یەوە بیرو باوەڕی شۆڕشگێڕیی بڵاوئەکردەوە ، بەڵام سەردەمێکیش پشت‌ماڵەو شاعیری کۆشکی قەیسەر بوو •• ڕەسووڵ هەمزاتۆف پارچـە شیعرێکی هەیە ئەڵێ : « من دڵم چووە لە سەد کچ » ••• جا برادەرینە! ئەگەر بە بیروباوەڕی ئێوە بێ ، ئەبێ پووشکین‌و هەمزاتۆف‌و سەرجەم شاعیرانی دنیا مائیع‌و نێرگسی بن !! خۆ شاعیرەکانی لای ئێمە نە ئـەم جۆرە شیعرانەیان وتـوەو نە چەکمـەی کەسـیشسیان لسـتوتەوەو ، بەرهەمەکانیشیان توانەوەیە لە خۆشەویستیی نیشـتمان‌و میللەت‌و چینی چەوساوەدا •• کەواتە ئیتر ئێوە بۆچـی ئـەم تیرو شـیرەتان بە ناوی ڕەخنەوە لێ خستوونەتە کار ؟••

ئەم چەند قسەیە ڕێخۆش‌کردنێك بوو بۆ چوونە ناو باسـەکە ، چونکە لام‌وایە ئەگـەر ئێمـە مەوزووعی‌یانە بیربکەینـەوە ، نەك نابێ کۆبلێت‌و دێرە شـیعرو پەرەگـرافە چیـرۆك لە سـەرجەمی بەرهـەم جیابکەینەوە ، بەڵکو ئەبێ کارلەیەك‌کردنی دیاردەکان‌و لێك نەپچڕانیان

---

(٢) أ • تڤاردۆڤسکی ، وتەیەك دەربارەی پووشـکین ، هەڵبژاردەی شیعرەکانی پووشکین ، مۆسکۆ ، ١٩٧٩ ، ل ٢٠ (بە ڕووسی) •

لە هەموو وتارو باسێکدا بخەینە بەرچاو • من لام وایە وتارەکەی کاک ڕەئووفیش هەر لە چوارچێوەی ئەم بۆرە ڕەخنانەدایە کە باسم کردن ، بۆیە ئەم سەرەتایەم بۆ هەڵچنی (٣) •

کاک ڕەئووف لەم وتارەیدا گەلێ جار من بەرەو ئاسمان بەرزئەکاتەوەو جاروباریش دێرە شیعرێکم لە بەرو دواکەی جیائەکاتەوەو بەتەنیا وەری ئەگرێت بۆئەوەی بە ئارەزووی خۆی لەو بەرزییەوە فڕێم بداتە خوارەوە •• ئەڵێت : « وەك ڕوونە مەحموود دەرێش لە ئاپارتمانە قەشەنگەکانی قاهیرەو بێرووتەوە ئازارەکانی مرۆڤی فەلەستینی دەنووسێتەوە • نایەوێت بە خودی وەك مرۆڤێك هاوبەشی یەك لە گۆڕینی مێژووی فەلەستیندا بکات • هەروەها کاك ئەنوەریش لەبێناوی مەسەلەیەکی گشتیو بەناچاری وڵاتی بەجێ نەهێشتوە • بخوێنی کوردی هەر کە دەوری بەرهەمێك ئەکاتەوە ، گرنگیو مەترسیی قۆناخەکە وای لێ کردوە کە بەپەرۆشەوە هەواڵی خاوەنەکەی ، هەڵوێستی، ڕادەی هاوبەشی کردنی لە گۆڕینی واقیعدا بپرسێت • بمانەوێو نەمانەوێ ئەوەیە هەستی تێکڕای ڕەشە خەڵکەکە، ئەگەر بۆ ئەوان بنووسین» (٤)•

جارێ پێشەکی ئەمەوێ بڵێم کاتی خۆی کە من هێشتا نیشتمانم بەجێ نەهێشتبوو ، ڕەخنەگر ئەم وتارەی ناردبوو بۆ گۆڤاری ( ڕۆژی کوردستان ) • وتارەکەش ـ وەك ئاشکرایە ـ سەبارەت بە شیعرێك نووسراوە کە من لە وڵات نووسیومەو لە زرووفێکیشدا نووسیومە کە خەڵکی لە ئازاری کۆستێکی گەورەدا ئەتلانەوە • ئەوەی من لەبیرم بێ

---

(٣) ئەگەر دەرفەت بوو لە وتارێکی تردا وەڵامی هەندێ بیرو ڕای تری ئەم جۆرە ڕەخنانە ئەدەمەوە •

(٤) ڕەئووف عوسمان ، بۆ کپ ببێ ؟ (وتار) ، نووسەری کورد ، ژمارە ٦ ، بەغدا ، ١٩٨١ ، ل ٧٤ •

ناونیشانی وتارەکەشی « چۆن کپ ئەبێ ؟! » بوو • دیارە کاك ڕەئووف یان دانەیەکی تری وتارەکەی خۆیی لا بوە ، یـان وەری گرتوەتەوەو ، ئیتر ئەم هەنگی سەفەر کردنەی منی لە کلۆرە داردا دۆزیوەتەوەو دەستی کردوە بە شۆڕشگێڕی فرۆشتن بە منو ناوونیشانی لاقرتی ئامێزی « بۆ کپ ببێ ؟ »ی داوەتە وتارەکەیو ئەیەوێت بە نای ناهـەق لە بخـوێنی بگەیەنێت کە من ئەم شیعرەم لە ئاپارتمانەکـانی ئەورووپاوە نووسـیوە ، لەکاتێکدا من ئەوەتـەی لەدەرەوەم هیچ شیعرێـکم لە چاپەمەنییەکانی ولاتدا بڵاونەکردوەتەوە • هەرچی ئەو ڕایەشیە کە ئەڵێ من بەشداریی بزووتنەوەی نیشتمانیی ولاتەکەم ناکەم •• ئەوە من پێویستم بەوە نییـە کە پاکانە نە بۆ ئەوو نە بۆ ئەوانەش بکەم کە وەکوو ئەو ئەنەقدێنن •• ئەوە واقیعو جەماوەرو مێژوو حوکمی ئەوە ئەدەن• من ئەوەتەی هۆشم کردۆتەوەو خۆمم ناسیوە لەومەیدانەدا درێغیم نەکردوەو پەنابردنە بـەر ئەدەبیشم هەر بە چەکێـکی ئەو جوولانەوەیە زانـیوە •• ئیتر نازانم بۆ هەندێکەس لایانوایە ئەوەی لە ئەورووپا بخوێنێ ئیتر ولاتو میللەتی خۆی لەبیرئەکات ، یان لە شاییو شاییلۆغاندا ئەژی •• دیارە چونکە ئەوانە خۆیـان ئاگری غەریـبیو دوورولاتی نەیسووتانـدوون • کاکی ڕەخنەگر ئەڵێی ئێرەیی بەوە دێت من هاتووم بۆ خوێندن • ئەگەر چـاو لە ڕاستییش نەنووقێنێت باش ئەزانێ من چـونو لە چ‌زرووفێکـدا هاتوومەتە دەرەوە • باشیش ئەزانێ کە شادبوونەوەی من بە دیدار ، بێ سەرفـرازیو سەرکەوتـنی میللەتەکەم نایەتـەدی ••• هـەر لـێرەداو لەبەرئەوە ئەتە موزایەدەیـەکی زۆری بەسەر منـەوە کردوە ، بـۆئەوەی بخوێنێش خۆی سەرپشك بێ لە هەڵسەنگاندنی هەڵوێستی هەردوولاماندا ، من ئەوەی بیرئەخەمەوە کە کاتێ ئەو ئەیتوانی لە ڕۆژانێکی لەباردا بچێت بۆ خوێندن ، ئەو ئا لەوکاتانەشدا نەچوو بۆ خوێندن ، نـەك بۆئەوەی

لەنزیکەوە هاوبەشی یەکی کارا لە گۆڕینی واقیعدا بکات ، بەڵکو بۆئەوەی کە بە دوو گوێی خۆم لێم بیستوە ئەیوت : « پیاۆ موودەڕڕیسی زمانی عەرەبی بێ باشترە لەوەی کە دوکتۆرای لە زمانی کوردیدا هەبێ ، چونکە مودەڕڕیسی یەکە لەوجۆرە دوکتۆرایانە مسۆگەرترە » •• من نە بۆ بازرگانیو نە بۆ کەیفو سەیفیش نەهاتوومەتە دەرەوە • بەخوا تەنانەت شەهادەشم لا پەشمە ، چونکە لەوباوەڕەدام کە هەرگیز شەهادە مرۆڤی نەکردوە بە خوێندەوار ئەگەر خۆی شتی لەبارا نەبووبێ • ئەگەر عەشقی زانینو خۆپێگەیاندن نەبڕایە ، من بەم تەمەنی سی ساڵی ژیانەوە چیمبوو لەوەی تازە بە تازە لە ژوورێکی داخلیدا لەگەڵ دوو قوتابییتردا بژیمو بەدیاری لەمپایەکەوە تا بەیانی شەونخونی بکێشم •• باوەڕم پێ ئەکات یان نەء ! ئەمە تەنیا سەوداسەرییو عەشقێکەو لاشمەوایە جۆگەلەیەکی ڕەنجو ئازارە کە ئەڕژێتە دەریای گەورەی خۆشەویستیی مرۆڤو میللەتەوە ••• عەشقی زانستو نیشتمانەو ، با جەماوەریش هەڵێکو سۆراخبرسی هەڵوێستی منو کەسانیتریش بن ••

کاك ڕەئووف باسی مەحموود دەروێش ئەکاتو ئەڵێت : «لە ئاپارتمانە قەشەنگەکانی قاهیرەو بێرووتەوە ئازاری مرۆڤی فەلەستینی ئەنووسێتەوەو نایەوێت بە خودی وەك مرۆڤێك هاوبەشی یەکی کارا لە گۆڕینی مێژووی فەلەستیندا بکات »(٥) • دوای ئەمەش باسی نیشتمان بەجێهێشتنەکەی من ئەکات • من لاموایە ئەمە بەراوردێکی نەگونجاوەو داخەکەم بێ دەرفەتی ناهێڵی ڕوونی بکەمەوە ، هەرچەندە من نامەوێ داکۆکی لەو هەڵوێستی فەلەستینی زەوتکراو جێهێشتنەی مەحموود دەروێش بکەم • بەڵام هەر شیعرەکانی مەحموود دەروێشیش بوون میللەتانی دنیاو

(٥) ڕەئووف عوسمان ، هەمان سەرچاوە ، ل ٧٤ •

ڕۆشنبیرانی جیهانیان زیاتر بە مەسەلەی فەلەستین ئاشنا کردو ، شیعرەکانی ئەویش وەك کەلەپوورێکی نەمرو جێگەی شانازیو بەخ هەر ئەمێننەوە .. جگە لەمەش ئەگەر بەم بۆچوونەی ڕەخنەگر بێ ، ئەبێ خەنێکی چەپو ڕاست بەسەر خەباتی هەموو ئەو پێشمەرگە فەلەستینییانەشدا بهێنین کە لە ئاپارتمانەکانی بێرووتدا ئەژین .. ئەی نازانم ڕەخنەگر بۆئەوەی بە خەیاڵدا نەهات کە یەکێ لە جوامێرترین شەهیدەکانی مەسەلەو ئەدەب (غەسسان کەنەفانی )یش هەر لە بەردەم یەکێ لە ئاپارتمانەکانی بێرووتدا بۆمبایەکی سەهیوونی لەشی پرزۆڵ پرزۆڵ کرد .. ئەی ئەو چۆن مەحموود دەروێش‌و خەڵکیتریش دڵنیا ئەکا لەوەی ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەمانیش لە شەقامەکانی بێرووت‌و ئەوروو پادا بە دەستی دوژمن سارد ناکرێنەوە ؟

ڕەخنەگر لە ڕەش‌بینی دانەپاڵ ئەم هۆنراوەیەدا کەوتووەتە گێژاوێکەوە نەیتوانیوە هەڵوێستێکی ڕوون بۆ بخوێنێ دەربخات . ئاشکراشە ئەم هۆنراوەیە لەکاتی بڵاوکردنەوەیدا ، جۆرە گێچەڵێکی نایەوەو سەرنجی بخوێنانی ڕاکێشا . من لاشم‌وایە لایەنە سیاسی‌یەکەی بوو سەرنجی خەڵکەکەی بەلای خۆیدا ڕاکێشا .

مامۆستا هێمن پێی‌وتم : « کابرایەکی سیاسیی گەورە ، کە لام‌وایە چ لە شیعر تێ‌ناگات ، شیعرەکەی بە دڵ بوو . پێم‌وایە هەر جۆش‌و خرۆشەکەی هەژاندبێتی » . مامۆستای نووسەر عەبدولمەجید لوتفی ، دوای بڵاوکردنەوەی ئەو شیعرە کە بینیمی ، وتی : « من وام بەخەیاڵدا ئەهات یەکێ ئەم شیعرە ئەنووسێ وەك دێوەکانی سلێمان کەتەو زل بێ ، چونکە نەڕەی نەبەزین‌و چۆکدانەدانێکی گەورەی تێدایە » . پیاوێکی نیشتمانپەروەری گەورەی کوردیش قسەیەکی ئەوەندە گەورەی دەربارەی

ئەو شیعرە کرد من خۆم نەمزانی لەئاست هەستو خۆشەویستیی ئەوو خەڵکی تریشدا بڵێم‌چی • سەرەڕای ئەمانە هەمووی مامۆستاو برای گەورەم کاکە حەمەی مەلا کەریم کاتی خۆی ئەم شیعرەی کرد بە عەرەبی‌و ، لەپێشیشدا بە زۆرەملێو بە شەڕی دەستەویەخەی لەگەڵ ئەم گۆڤارو ئەو ڕۆژنامەدا ، لە ڕۆژنامەی (عێراق)دا بڵاوکرایەوە • من لام‌وایە کاکە حەمە ئەگەر پێی وابوایە شیعرێکە ڕەشبینیی تێدایە ، نەیئەکردە عەرەبی • پەسندکردن‌و نەکردنی ئەویش بۆ شیعری من لەوەدا دەرئەکەوت کە شیعرێکم بۆ ئەخوێندەوە ئەگەر بچوایە بە دڵیا ئەیوت داینێ ئەیکەمە عەرەبی • خۆ ئەگەر بەدڵیشی نەبوایە ، ئەیوت : ئافەرم ! ئافەرم ! وەك تۆزێ لەمەوپێش وتم هەڵوێستی ئەو نووسەرو خەڵکانەش زیاتر لەوەوە هاتبوو کە شیعری « چۆن کپ ئەبم ! » میللەت هان‌ئەدا بۆ نەبەزین‌و خەبات‌کردن ، ئەم مەسەلەیەی کاکی ڕەخنەگر ئاوەژووی کردوەتەوەو ئەیەوێ بەجۆرێکی‌تری لە خەڵك بگەیەنێ •

لە وتارەکەی کاك ڕەئووفدا بەئاشکرا هەست بە شپرزەیی‌و بێ‌ پرۆگرامی‌و نەبوونی پێوەندی مەنتیقی ئەکەین • وتارەکە پڕیەتی لە ناکۆکیی بیرو ڕا • وا من هەندێکی ئەخەمە پێش چاوی بخوێنی بەڕێز • لەوشوێنانەدا کە وەسپی من ئەکات ئەڵێ :

« شاعیریش وەك دەنگێکی زوڵاڵ ، کە خاوەنی مۆرکی تایبەتیی خۆی بێت ، ئەوە ئەچریکێنێ‌و ، لە جەرگی کون‌کونی شمشاڵی هۆنراوەدا، ئاوازی سەرسەختی‌و پێ‌داگرتنمان بۆ دەڵێت » ( نووسەری کورد • ل ٦٩ ) •

« ئەوەتانێ شاعیر چەمە زستانە نی‌یە هەتا کزربێتەوەو بکەوێتە گیان‌کەنشت ، بەڵکو چاوگێکی نەسرەوتەو بە جەرگی زەویی وشك‌و

برینگدا دەچێتە خواریو نەمامی نوێ بنج‌بەست دەکات » ( نووسەری کورد • ل ٦٩ ) •

« شاعیر نایەوێت لە لیتەو زۆنــگاوی خەمــدا ونمان‌کات‌و بەکوڵ فرمێسکی کۆڵەواریمان پێ هەڵڕێژێت ، یان لە ئاوێنەی سەردەمدا تابلۆی تەڵخ‌و دەستەوسانیمان بۆ بنەخشێنێ ، چونکە ئەم دیاردەیە ڕەوشتی ئەو مرۆڤانەیە کە بڕوایان بە ڕۆڵی مێژوو نی‌یە » (نووسەری کورد • ل٧١)•

« ••• بەڵکو وەك مرۆڤێك کە جێگای خۆی لە کاروانی مێژوودا بزانێت » ( نووسەری کورد • ل ٧٨ ) •

کــاك ڕەئووف لەو ڕســتانەی ســەرەوەو گەلێــکی‌تردا وا مــنی بەرزکردوەتەوە ، کەچی هەر لە هەمان وتاردا ئەمانەشی نووسیوە :
« ••• بە ڕەنگی خۆڵەمیشی سەرکڵۆم دەکرێت ، کە ئەو ڕەنگە خۆی لە خۆیدا هەستی خامۆشی‌و ساردبوونەوەمان دەداتێ••» ( نووسەری کورد • ل ٧٣ ) •

« هەروەها کاك ئەنوەریش لەپێناوی مەسەلەیەکی گشتی‌و بەناچاری ولاتی جێ‌نەهێشتوە • بخوێنی کوردی ئەمڕۆ هەر کە دەوری بەرهەمێك دەکاتەوە ، گرنگی‌و مەترسیی قۆناخەکە وای‌لێ‌کردوە کە بەپەرۆشەوە هەواڵی خاوەنەکەی ، هەڵوێستی ، ڕادەی هاوبەشی‌کردنی لە گۆڕینی واقیعدا بپرسێت • بملەــەوێ‌و نەمانــەوێ ئەوە هەــستی تێــکڕای ڕەشە خەڵکەکەیە ، ئەگەر بۆ ئەوان بنووسین » ( نووسەری کورد • ل٧٤ ) •

« خونکی‌کردنی خودی شاعیر یا ناچارکردنی بۆ پیاهەڵدان ، دوو ڕووی تاریکن بۆ دروست‌کردنی ـ نەك داهێنانی ـ بەرهەمێکی نەزۆك‌و کۆڵەوار [ نازانم من خونکیم بۆ کێ کردوە ؟ ـ أ•ق؛] » ( نووسەری کورد • ل ٧٤ ) •

« هەروەها سەربەستیو داهێنان ( الحرية والابداع ) پێوەندی‌یەکی جەدەلی‌یان لەنێواندا هەیەو بێ‌یەك نایانکرێ • هەڵدانەوەی لاپەڕەی ئەو شاعیرە نەزۆکانەی کە وشەی پیرۆزیان لە ژێرپێی نازیەتو بۆرجواو دوژمنانی میللەتدا هەڵپڕووکاندوە ، باشترین بەڵگەیە ، هەروەك ئەزرا پاوەندو گەلێکی‌تر • لە لایەکی تریشەوە ئەو هەڵوێستەی شاعیر ( أضعف الایمان )ە •• چونکە شاعیری سەردەم نەك ئەبێ خونکی بۆ خانەدانە نەگریسو زۆردارەکان نەکاتو بەس ، بەڵکو گەرەکە دژیشیان بوەستێ [ وەك بڵێی من لەو شاعیرانە بم ـ أ • ق ] ( نووسەری کورد • ل ٧٧، ٧٨ ) •

« ئەوەی جێی سەرنجمە نە لای ئەنوەر نە لای دەروێش رەنگی سەوز نی‌یەو بێ‌بەرایشە• ئیتر نازانم بۆ ؟ »(نووسەری کورد• ل٧٤)•

« هەرچەندە هەر ڕەشبینی‌یەکەی تێدایەو بە ئامانو زەمان لێی جیانابێتەوە » ( نووسەری کورد • ل ٨١ ) •

« لام‌وابێت وەك کورد دەڵێت ( ئەگەر دایك وەسپی کچی خۆی بدانەوە ، ئەبێت خاڵ بیخوازێت ) » (نووسەری کورد • ل ٨٢) •

**جا بخوێنی بەڕێز !**

خۆت بەراوردێك لەنێوان ئەم چەند ڕستانەدا بکە • منێك کە « جێگای خۆمم لە کاروانی مێژوودا زانیبێو نەمەوێ لە لیتەو زۆنگاوی خەمدا وتتان‌کەمو فرمێسکی کۆڵەواریتان بێ هەڵڕێژم ، یان لە ئاوێنەی سەردەمدا تابلۆی تەڵخو دەستەوسانیتان بۆ بنەخشێنم •• چەمە زستانە نەبم هەتا کزربمەوەو بکەومە گیان‌کەنشت ، بەڵکو چاوگێکی نەسرەوت بمو بە جەرگی زەویی وشكو برینگدا بچمە خوارەوەو نەمامی نوێ

بنج‌بەست بکەم ، ••• منیکی ئاوا بۆ ئەبێ هەر لە قەڵەمی هەمان ڕەخنەگرو لە هەمان وتـاردا ••• کابرایـەك بـم لەبـەر بەرژەوەنـدی خۆمولاتم جێ‌هێشتبێ‌و بە هیچ شێوەیەك ڕەنگی سـەوز لە شیعرەکانمـا نەبێ‌و ، ڕەشبینی‌یەکی وەها لە شیعرەکانمدا بێ کە بە ئامان‌و زەمان لێ‌یان جیا نەبێتـەوە ••• تەنانـەت بـرای ڕەخنـەگر شۆڕشـگێڕێـکی ئەوەنـدە دووئاتەشەش بێ کە هەڵوێستی من بە ( أضعف الایمان ) لێك‌بداتەوە !

من لاموایـە ناکۆکـیی ڕاکانـی کاك ڕەئووف لەو چەند دێرەی کەوانەکەدا دەرئەکەوێ • هـەرچی ئـەم مەسەلـەی ڕەشبینی‌و خـەم‌و ئازارەشە ، ئـەوە چ کاك ڕەئـووف‌و چ هەنـدێ ڕەخنـەگری‌تریش (لێم‌ببوورن!) بە ساکاری‌و سادەلەوحی بۆ ئەم مەسەلەیە ئەچن •• یان هەر ئەیانەوێ موزایەدەی شۆڕشـگێڕێتیمان بـە دەم‌و قسـە بەسەرەوە بکەن •• مـن لەمەودوا لـەم وتـارەدا نموونـەو ڕای نووسەرو شاعیرە پێشـکەوتنخوازەکانی دنیـام هێناوەتـەوەو ، نەشچـووم بـە پەرێـزی خەڵکی‌تردا • ڕای ئەو شاعیرو نووسەرانـەم هێناوەتەوە کە بەرهەمـی گەلێ نووسـەرو شاعـیری هەڵکەوتـووی لای ئێمـەش بـەو گیانـەوە نـووسراون‌و ئەچنـە ڕیـزی ئـەو بەرهەمـە پـڕ لـە گەوهەرانـەی مرۆڤایەتی‌یەوە • •

**براینـە !**

شاعیرێك ، نووسەرێك کە هەموو ژیانی لە چەرمەسەری‌و ئازارو شـەڕو هـاوڕێ‌و کەس‌وکـار کـوژران‌و شـارو دێ وێران‌کرانـدا بەسەربردبێ •• شاعیرێك کە لەناو خوێن‌و ئازارا چاوهەڵبێنێ ئەبێ باسی ئەم شتانـە نەکات‌و وەك بـەدەم فریشـتەوە پێ‌بـکەنێ – بەدەم ئێـوەوە

پێ‌بکەنێ •• هەر بۆئەوەی ئافەرەمو مۆرەکەی لای ئێوە مسۆگەر بکات • یا وەك فس‌فس پاڵەوان‌و دۆنکیشۆت بە نووکی شەق ئاسن پەراش پەراش بکات •• من لام‌وایە بەرچاوڕوونیی وەها ئەبێتە مەخسەرەی ساکارترین کەسی کۆمەڵێ کە لە ئازارو سزادا بژی •• غەسسان کەنەفانیی شەهید ئەڵێ : « هەندێ لەو پاڵەوانانەی چیرۆکەکانی ڕابوردوومان پفیـــان تێ‌ئەکراو زیاد لە پێویست بەرچاو ڕوون ئەخرانە پێش چاو • من ئەوانەم وەك ئەو کابرایە دێتە پێش چاو کە بە چۆڵەوانی‌یەکدا تێ‌بپەڕێ‌و لەترساندا فیکە لێ‌بدات » • دەربڕینی ئازارو خەم مانای ورەبەدان نی‌یە ، بەڵــکو هاندانی خەڵکە بۆ نەهێشتنی •• بۆ ڕامالینی •• من لە بەرهەمی هیــچ شاعیرێکی ڕاستەقینەی لای خۆمانــدا نەمدیــوە خەڵك بــۆ ورەبــەردان هان‌بدات ، یان بە ڕوانینێکی بەرەڵلایی‌یەوە گاڵتە بــە خەبــات کردن‌و تێکۆشان بکات •• بەپێچەوانەوە ، هەرچی باسی خەم کردنە ، بەپێچەوانەی ئەم مەبەستەیە • من ئەتوانم لە دەیان کتێب نموونەتان لە بەرهەمی شاعیرە پێشکەوتنخوازەکانی دنیا بۆ بهێنمەوە •

ئێلوار ئەڵــێ :

**مرۆڤ بیر لە نەزانین ناکاتەوە**
**کەچی نەزانییش بڵاوە •**
**هیوام بە هەموو شتێك هەبوو ،**
**لە هەموو شتێ ناهومێد بووم •**
**لە ژیان ، لە خۆشەویستی ، لە لەبیرچوونەوەو خەو**
**لە هێز ، لە لاوازی ••**
**کەسێ نەماوە بمناسێ ••**
**ناوو سێبەرم دوو گورگن (٦) ••**

---

(٦) پۆل ئێلوار ، هەڵبــژاردە ، گــۆڕین‌و پێشــەکی بۆ نووسینی د • سامیە ئەحمەد ئەسعەد ، بەغدا ، ١٩٧٩ ، ل ١٩ •

ئەتوانم بە دەیانو بیستان پارچەی ئاوا لە شیعری ئێلوارو ئاراگۆنو مایاکۆفسکیو یێسینین بهێنمەوە • جا تۆ بڵێی ئەوانەش بەرەڵلاو شاعیری نامولتەزیم بن • جا ئەگەر وابێت کێ ئەمێنێتەوە لەم جیهانەدا ؟

بلۆك ، ئەو بلۆکەی کە یەکێك بوو لەو چەند نووسەرەی دوای شۆڕشی ئوکـتۆبەر ، کە هاوبەشیيان لەو کۆبوونەوەیەدا کرد کە لـە (سمۆلنی) بۆ باسی کولتووری شۆڕشگێڕانە کرا •• ئەوەیە کە ئەڵێ : « بە هەموو لەشو بیرو هۆشو دڵەوە گوێ بۆ شۆڕش شلکە » • هەر ئەویشە کە ئەڵێ :

**سەدەکان ئەڕۆن ، جەنگ هەراو هورياياەتی**
**یاخیبوون هەستاوەتە سەر پێیان ••**
**دێهاتەکان ئەسووتێن ••**
**تۆش هەروەهای ، ئەی وڵاتەکەم !**
**لە ڕەنگی کۆنو گریاناویدای ••**
**تا کەی دایکەکان ئازار ئەچێژن ؟!**
**تا کەی داڵەکان ئەسووڕێنەوە ؟! «(٧)**

ئەگەر بە ڕای ئەو ڕەخنەگرانەی لای ئێمە بێ ، نابێ (بلۆك)یش پرسیار بکات ، چونکە پرسیارکردن ئاژاوەچییەتیو سەر لێشێوانە •

پابلۆ نیرۆدا ئەڵـێ :

**فیدریکو ! تۆ جیهانو شەقام ،**
**ترشیو ناخۆشیی لەیەکجیابوونەوەی دۆستان**
**لە ئێستگەی شەمەندەفەرەکانا ئەبینی ••**
**کاتێ کۆڵەکەی دوا دووکەڵ بەرەو دوور ئەکشێ بەرەو شوێنێ**
**کە هەمووی تلەبەردو جیابوونەوەو هێڵی شەمەندەفەرە ••**

---

(٧) أ • بلۆك ، سەرجەمی بەرهەمەکانی ، بەرگی یەکەم ، لێنینگراد ، ١٩٨٠ ، ل ١٧ ( بە ڕووسی ) •

**لەوێ کە هەر ئاپوورەی خەڵکی پرسیارکردووە ،**
**لەوێ کە هەر کوێرێ لە خوێنا خلتانە ،**
**خەڵکی بێزارو کەلەیی‌یە ،**
**درەختی فرمێسکو درکە ...**
**لەوێ کە چەتەو ڕێگر**
**بە سەرشانی ڕەشیان تالآنی ئەگوێزنەوەو چەپاو ئەکەن ..**
**ژیان ئاوایە فیدریکۆ ... (٨) .**

ئەگەر بە ڕای کاك ڕەئووف بێ ، نیرۆداش هەموو ژیانی بەلاوە ئەوەیە کە هەر دووکەڵی ئێستگەو چەتەو ڕێگرە «ژیان ئاوایە فیدریکۆ!».. باوەڕیش ناکەم کەسێ هەبێ ڕایەکی ئەوەی بکەوێ گومان لە بەرهەمو هەڵوێستی نیرۆدای شەهید بکات . من ڕووی دەم ئەکەمە بخوێنی بەڕێزو ئەڵێم : ئەگەر سەرجەمی ئەم هۆنراوەیەی نیرۆدا کە بۆ ( لۆرکا )ی هاوڕێی نووسیوە ، باسی ئەوە بوایە کە لۆرکا تۆش مردی ، گرنگ نی‌یەو دنیایەکی ڕازاوە هەر پێکدێنین .. ئەوکانە ئەمانوت نیرۆدا خەنجەر لە کا ئەدات‌و نەیتوانیوە مردنی نزیکترین هاوڕێی بخاتە چوار چێوەی شیعرێکەوە ، یا سەگ‌دڵەو مردنی هاوڕێی خۆی بەخەیاڵدا نایەت . . بەڵام ئێمە کە ئازارەکانی نیرۆدا ئەخوێنینەوە ، لەلایەکەوە زیاتر مەرگی لۆرکامان بۆ گەورە ئەبێ‌و شیعرەکەش بەو گیانە تراژیدیایی‌یەوە ئەبێتە زائیدێك لەسەر مردنەکەو ڕقمان سەد ئەوەندەی تر لە فاشی‌یەکان ئەبێتەوەو زیاتر خەبات ئەکەین بۆ لەناوبردنیان .. هەروەکو نابێ ئەم هۆنراوەیە لە سەرجەمی بەرهەمەکانی نیرۆداو هەڵوێستیشی جیا بکەینەوە .. ئەگەر ئەشڵێت نیرۆدا شینی شاعیرێکی کردووە ، خۆ شیعرەکەی من بۆ

---

(٨) پابلۆ نیرۆدا ، سەرجەمی بەرهەمەکانی ، بەرگی یەکەم ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ ، ل ١١٧ ( بە ڕووسی ) .

کارەساتێکی زۆر زۆر گەورەتر نووسراوە •• هەر لێرەدا ئەمەوێ دەربارەی ئەم ڕەشبینیو نائومێدی‌یە هەندێ قسەی‌تر بکەم :

زۆر جار بابەتێکی هونەری ، سا شیعر بێ ، چیرۆك بێ ، تابلۆیەك بێ ، پارچەیەك مۆسیقا بێ ، ئەگەر بە ڕووکەشیی هەڵیسەنگێنین ، ڕەشبین دەرئەکەوێ •• ڕەنگە هەندێ بابەتی‌تریش هەبن لەوانەبن کە بە «مواصفات»ی ئەم ڕەخنەگرانە بنووسرێن ، پڕ بن لە فس‌فس پاڵەوانێتی •• بەڵام لەکاتێکدا کە بەوردی لە هەردوو پارچەکە ئەکۆڵینەوەو ئەچینە بنــجو بناوانیان ، بۆمان دەرئەکەوێ کە پارچە بەڕواڵەت نائومێدەکە تەئسیر لە خەڵك زۆرتر ئەکات ، تا بەڕواڵەت گەش‌بینەکە • بۆ ؟ چونکە لە واقیعەوەو لە ئازارو ئاواتی ڕاستەقینەی خەڵکەکەوە هەڵقولاوە ، بۆیە زیاترو زووتریش ئەچێتە دڵیانەوە ، وەك لەو پارچەیەی بە دەم هیچ ناهێڵێتەوەو بەهەشتە درۆزنەیەك لەناو سەرانسەر دۆزەخێکدا دروست ئەکات • ئەگەر بێینە سەر واقیعیش ، بابەتە بەڕواڵەت نائومێدەکە زیاتر خەمی دروست‌کردنی ئەو بەهەشتەی هەیە ، بەڵام نایەوێت وای لە بخوێنێ بگەیەنێ کە بە دوو فوو و سەبرێ ئەمە دروست ئەبێ •

بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی ئەم ڕایەمو سەلماندنیشی «ڕازی تەنیایی»ی شاعیری گەورەی کورد ( هەردی ) بەنموونە دێنمەوە •• هەرچەندە من نامەوێ شاعیری ئەمڕۆ بەو گیانو هەناسەیەوە شیعر بنووسێو شیعرەکەی منیش جۆرێکی‌ترەو لەگەڵ ئەوەشدا هەردی خاوەنی ( ئازادی‌خوا )و ( ئاگری سووری ئیرهابی عورفی )و گەلێ شیعری زەقی سیاسیی شۆڕشگێڕانەی‌ترەو ، خۆشی کاتی خۆی بۆ نەشێواندنی بیری لاوی کورد ، سڵی لە بڵاوکردنەوەی ( ڕازی تەنیایی ) کردوەتەوە •• بەڵێ

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا من لە برای ڕەخنەگر ئەپرسم : ئایا زوربەی زۆری لاوانی خوێندەواری کورد ئەو شیعرانەیان لە کەشکۆڵەکانیانـدا نەئەنووسی‌یەوەو بـە سـۆزو خرۆشـەوە لەبەریان نەئەکـردو چەندین گۆرانی‌بێژیش نەیانکردوەتە گۆرانی ؟ ئایا ئەو شیعرانە تائێستەش تام‌و چێژی خۆیان لەدەستداوە ؟ ئایا ئەو شیعرانە بەوپەڕی ڕاستگۆیی‌و جۆش‌و خرۆشەوە ئەندێشەی لاوێکی کوردی چەوساوەیان لە کۆمەڵێکی نەریت‌ڕزیودا بە گەرمی‌و ڕوونی نەخستۆتە پێش چاو ؟ ئەگەر هەردی‌یش لە شیعرەکانیدا بهاتایە بەرچاو ڕوونی‌یەکی ساکارانەی بنووسیایەو بیوتایە «وەڵلا حەزم لە مت فاتمە کردو باوکیشی بەگەرمەوە پێشوازیی لـێ کردم‌و دەستی کچەکەی دایە دەستم ، ئـەوسا نـە دەسـتەی لاوان لـە دەفتەرەکانیانـدا ئەیان‌نووسی‌یـەوەو نـە ئەبوونە گۆرانـیی سـەرزاری خەڵکیش‌و نە هەردی‌یش بەو کۆمەڵە شیعرە بە ژمارە کەمە ئەبوە ئـەو شاعیرە گەورەیە • من لام‌وایە « ڕازی‌تەنیایی » ئیدانەیەکی گەورەی ئەو نەریت‌و خووە ڕزیوانەیە کە تائێستەش ئێمە بەدەستیانەوە ئەناڵێنین • من بەش‌بەحاڵی خۆم ئەڵێم ئەو شیعرانەی هەردی بە سەدان لاوی هانداوە کە ڕێـگایەکی سیـاسی بـدۆزنەوە بۆ نەهێڵانی ئەو چەوساندنەوە چینایەتی‌و دەردە کۆمەڵایەتی‌یانەی کە لەژێر باڵـی ڕەشیاندا هـەزاران دڵداریان نائومێد کردوەو هەزاران دوو دڵیان هەڵوەراندوە •• لێرەدا ئەو قسەیەی نووسەری گەورەی ڕووس چێخەفم ئەکەوێتەوە بیر کە ئەڵێ : « ڕاست‌و ڕەوان ئەمەوێ بە خەڵك بڵێم سەیری خۆتان بکەن •• سەیربکەن لـە چ ژیانێکی ناهەموارو تاڵدا ئەژیـن •• گرنـگ ئەمەیـە خەڵـکەکە ئەمە تێ‌بگەن ، چونکە کە تێی گەیشتن ، ژیانێکی چاکتر بنیات‌ئەنێن •• ژیانێك کە هیچی لەم ژیانە نەچێت » (٩) •

---

(٩) أ • پ چێخـەف ، سەرجـەمی بەرهەمەکانی ، بـەرگی یەکەم ، ١٩٨٠ ، مۆسکۆ ، ل ٣ •

هەروەها کاك ڕەئووف لـە ڕووی زمانــەوە هەندێ ڕەخنەو وردە تێبینیی دەربارەی شیعرەکە هەیە • من لام‌وایە ڕاکانی هەندێکیان لە جێی خۆیاندا نین • ئەو ئەڵێت : « بەکارهێنانی وشەی (لادێیی) ڕەنگدانەوەی خۆبەزل‌زانینی شاری‌یە لەئاست دواکەوتوویی لادێ‌دا ••• خۆ ئەگەر وشەی (جووتیارەکان) بوایە ئـەوا شیاوتر ئەبـوو » (١٠) • پێشـەکی ئەمەوێ ئەوە بڵێم کە من نەك باوەڕم بە مەسەلەیەکی تەسکی وەك شاری‌و لادێیی نی‌یە ، لای من جیاوازیی ڕەگەزو خوێن‌و پێست‌و ئەم بەندو باوانەش ڕزیوو بەپەند بوون • خۆ ئەگەر بەو پێوانەیەی کاك ڕەئووفیش بێ ، من خۆم لادێیی‌م‌و شاری نیم •• هەرچی وشەی «جووتیارەکان»یشە وشەی (لادێیی) مەفهوومێکی فراوانتری لەو هەیە ، تەنانەت وشــەی جووتیار پڕبەپڕی وشەی ( فەلاح )یش نی‌یە ، چونــکە جووتیــار ئەو کاڕایەیە کە فەلاح بۆ جووت‌کــردن بەکرێی ئەگرێــت • ڕاستە ئــەو مەبەستەی کاك ڕەئووف بۆی چوە ، لەناو خەڵکیدا هەیە ، بۆنموونــە عەرەب لەناو خۆیاندا بۆ گاڵتە ئەڵێن (مثل القروي)و بە ڕووسی‌یش ئەم تەعبیرە هەیە •• بەڵام هەر ( یێسینین)ی شاعیریش هۆنراوەیەکی خۆیی ناوناوە «من دوا شاعیری لادێم » ، حسب الشیخ جعفریش ناونیشانی ئەم شیعرەی وا کردوەتە عەرەبی : « أنا آخــر الشعراء القرويين » (١١) • لەبەرئەوە ئەشێ بە هەردوو بارەکەدا بەکاربهێنرێت‌و ، وەك کاك ڕەئووف بۆی چوە من بەو لووت‌بەرزی‌یەوە بەکارم‌نەهێناوە •

هەروەها لای‌وایە وشـــەی ( وردیـلان )و ( ئاواران ) بەهەڵە

---

(١٠) ڕەئووف عوسمان ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٨٤ •

(١١) یێسینین ، قصائد مختارة (ترجمة حسب الشیخ جعفر ) ، بغداد ، ١٩٨٠ ، ص ٤٥ •

یەکارهێنراونو ئەبێ بڵێین (وردیلەکان)و (ئاوارەکان) (١٢) • بێ گومان ئەم کۆیانــەی دوایــی ناسراو ( معرفة )ن • هەرچی ئەوانەیــە کە من بەکارمهێناون واتە (وردیلان)و (ئاواران) ئەوە نەناسراون • کاك ڕەئووف ئەبوایە ئەمەی لەبیرنەکردایە• ئەگەر ئەشلێ کورد قەت ناڵی (وردیلان)و (ئاواران) ، ئــەوا من ئــەم نموونانــەی ئەخەمــە پێش چــاوو ئەتوانــم دنیایەکی‌تریشی نموونە بۆ بهێنمەوە :

**( هەوران ) کۆبەکۆیە**
**دڵ موفتەلای تۆیە**

(فۆلکلۆر)

**چەند ( شاران ) گەڕام ، چەند خاکەساری**
**بۆم بە شۆڵەکەی هەق نادیاری**

(فۆلکلور)

**( داران ) لە دوورەوە سەریان سەوزە**

(قسەی نەستەق)

**بلا سا شار بە شارو دێ بە دێ بین**
**لە دەس یاران بکەین طەیی ( ولاتان )**

(نالی)

**نمانا جەمین شای ( سۆسەن خالان )**
**کەم کەم جە گۆشەی لای ( سیامالان )**
**چون شێویا لانەی ( دلان پڕ داخان )**
**جۆق جۆق سیامال شین پەی ( لەیلاخان )**

(مەولەوی)

---

(١٢) ڕەئووف عوسمان ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٨٥ •

**لە بان ( هەوران ) بژین یا تەختی ( بەحران )**
**لە داویان خەن بە فیڵو فەنو ( مەکران )**

**(هێمن)**

ڕاستی‌یەکەشی ، یەکەم مـن زۆر جـار نامـەویَ ئـەم وشـانە لە سووریَکی تەسکدا بخولێنەوە وەك ماناو وەك شێوەش ئەمجۆرە (ئان)انە سووکترو خۆشترن لەسەر زمانو شیعر بەو پیتی کافە تەنگەنەفەس ناکەن• بەختی خۆی مامۆستام دوکـتۆر عیزەددین شـیعری ( زینـدە خەوو ….ایی‌یەکان)ی منی کردە عەرەبی، من کۆمەلیَ وشەی وەك (ئاوارەکان، …قامەکان ، درەختەکان •• هتد )م بەکارهێنابوو • دوکـتۆر ڕای وابوو …مە لە عەرەبی‌یەوە هاتوەتە زمانی کوردیو ئامۆژگاریی ئەوەی کردم کە بنووسم شەقام ، درەختو وتی : ئەوە لە کوردیدا مانای جەمعیش ئەدات

هەرچی بەکارهێنانی ( ئەم دنیا )و ( درەختیَ بەرز)و ( شـەویَ خامۆش )و ( شەویَ زستان )یش هەیە •• ڕاستە وەك کاك ڕەئووف …ێ ئەمە ( درەختێکی بەرز )و (شەوێکی خامۆش) (١٣)و ••• هتدە ، …ڵام لە ناوچەی گەرمیان (درەختیَ بەرز)یش ئەڵێنو من ئەمەم لا سووكو ئاسانترەو لاموایە بۆ شاعیریش هەیە زمانی خۆی بە سامانی سەرجەمی دیالێکتەکان دەوڵەمەند بکات • ئەمێنێتەوە مەسەلەی ( ئەم دنیا ) یا ( ئەم دنیایە ) ، ئەوە من وام لە خەڵك بیستوە :

**ـــ ئەم دنیا قسەم بۆ بکات من عەقڵم نایگریَ**
**ـــ هەرچی ئەم دنیا هەیە هەڵسیَ ، دەسی لیَ هەڵناگرم**

---

(١٣) ڕەئووف عوسمان ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٨٦ •

نازانم ڕاستەکەم یا نە ، بەڵام لاموایە ( ئەم دنیایە ) زیاتـ تەعبیری ناوشاری سلێمانی‌یەو لە (ێ)ی حەوت لەسەری ( هاتمەوانێ (ئەڕۆمەوانێ) ئەچێ ..

جگە لەمانەش سەرنجی تایبەتیم بەرانبەر هەندێ لە بیرو ڕاکانی‌تر کاك ڕەئووف هەیە . کاك ڕەئـووف هاتوە وەك مەسەلـەی ( ولاتقر الصلاة)ەکەی لەگەڵ شیعرەکەی من کردوە ، کۆپلێتێکی پارچە پار کردوەو سەرەتای لە کوتـایی جیـا کردوەتەوەو هەنـدێ ڕای لەسـ بنیات‌ناوە . من ئەڵێم :

**سەرم پێشانگای مردنەو تابلۆکانی هەموو ڕەشن**
**سوورن ، ئاڵن ، خۆڵەمێشین ..**
**سەرم ژوورێکی چوارگۆشەی یەك‌پێ‌یی‌یە**
**تۆی تیا دیلی ، سەرت بەسەر ئەژنۆکانتا شۆڕبۆتەوە**
**ئای کە بەرزی ! چاوت ئاسمانێکە ڕۆشن**
**ڕۆژ دێو کڕنووشت بۆ ئەبا ..**

ئەو هاتوە نووساوە بە دێڕی یەکەمەوەو ئیتر دێڕەکانی‌تری بە . شی‌کردوەتەوە . لای من سەرەنجامی کۆپلێتەکە دوا دێرە : « ڕۆژ دێ کڕنووشت بۆ ئەبا ! » .. گوایە ئەمەش هەر ڕەش‌بینی‌یە ؟! هەرچ نەبوونی ڕەنگی «سەوز»یشە لە پێشانگای مردنی سەری من‌دا ، ئـە پێوەندی زیاتر بە نەگونجاویی وێنەکەوە هەیە . پێشانگایەك ئەگەر هـ مردن بێ ، ڕەنگی سەوزی لەکوێ تیا دەست ئەکەوێت‌و ، مەسەلەش ڕەش‌بینی‌یەو نە مەش‌بینی !.. مەسەلە مەسەلەی تەناسوقە لە دروستکرد وێنـەدا .

کاك ڕەئووف باسی شیعری ( خۆزگەی شەوانی باران)ی لەتێة هەڵمەت‌و هیی من ئـەکات . لە پەراوێـزی ژمـارە ٢١ی لاپەڕە ٢٩

وەسیویەتی : شێوەی دەربڕینەکان ئاسمانو ڕێسمانە •• واتـە هـیی ـەنو لەتیف •• ئیتر تێناگەم لەتیف لـە ئاسمانەو مـن ڕێسمانم ، یان ەپێچەوانەوە •• ئەمە لای من گرنگ نییە • بەڵام ئەگەر دەربڕینەکەی ەتیف لە ئاسمانە بۆچیو ، ئەگەر هیی منیش وانییە ، بـۆچی ؟ یـان ەپێچەوانەوە • ڕەخنەگری ڕاستەقینە ئەبێ بەڵگەی تەواو بۆ ڕاکـانی هێنێتەوەو قەناعەت بە بخوێن پەیدا بکاتو ، تا کەیش ئەم جۆرە تەعبیرە حەڵەبییانە لە فەرهەنگی ڕەخنەی ئێمەدا مۆڵئەخۆن ؟!

لە شوێنێکیتردا ڕەخنەگر دێڕە شیعری :

**« کە ناتوانن سەرکەونە سەر تەلاری بەرزی هۆنراوەم ،**
**لە خوارەوە بۆی مەڕوانن » •**

ی منی هێناوەتەوەو ئەڵێ : «شاعیر وەسپی شیعری خۆی ئەکاتو وەك ئەوە وایە کە کورد ئەڵێت ( ئەگەر دایك وەسپی کچی خۆی بدانەوە ، نەبێت خاڵ بیخوازێت ) (١٤) • هەر کاکی ڕەخنەگر خۆی نموونـەی ە شیعری (نالی)و (حاجی قادر) هێناوەتەوەو وادیارە لاقرتیی بەو شانازی بەخۆوەکردنەی ئەوانیش دێ •• ئەو ئەیتوانی بڵێ کابرا تۆ هێشتا لەکوێتە لاسایی ئەوان بکەیتەوە •• ئەیتوانی بـڵێ شیعرەکەی تـۆ باتەقای ئـەو شیعرە جوانانەی ئەوان ناکات •• ئەوکاتە من لاریم لەم ڕایەی نەئەبوو • بەڵام ئەو ئەگەر لەو شانازی بەخۆوە کردنەی ئەوانیش نابەدڵو لالووت بێ ، ئەوا بەهەڵەدا چوە ، چونکە شانازی بەخۆوەکردنی شاعیر لە ئەدەبی هەموو میللەتاندا هەیە • جەواهیری ئەڵێ :

**أنا حتفهم •• ألج البيوت عليهم**
**أغرى الوليد بشتمهم والحاجبا**

---

(١٤) ڕەئووف عوسمان ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٨٣ •

وائەزانم جەواهیریش نەنەویوە لە لوولە ڕەقێكو بكەوێتە گیانی کۆنەپەرستانو کلکەکانی ئیمپریالیزم • پووشکین ئەڵێ :

**پەیکەرەکەم لە ستوونەکەی ئەلکساندەر نیقسکی**
**بەرزتر ئەبێت (١٥) ••**

بلۆکیش دوای نووسینی هۆنراوەی (دوانزە) ، لە دەفتەری بیرەوەری‌یەکانیا نووسیویە :

**ئەمڕۆ من بلیمەتم ••**

یەسینینیش ئەڵێ :

**لەو باکوورە ، بەتایبەتی لە ڕووسیا**
**من شاعیرێکی دیارو ناسراوم (١٦)**

من مەبەستم ئەوە نی‌یە خۆم بەرمە ڕیزی ئەمانەو نموونە هێنانەوەش ئەوە ناگەیەنێ کە ئەوکەسەی نموونە ئەهێنێتەوە چوەتە ڕیزی ئەو جۆرە کەسانەوە کە ئەیانکا بە بەڵگە • بەڵام کەسیش نەهاتوە بەم شاعیرانە بڵێ کابرا ئەم فیزلی‌و ژاوەژاوو بەخۆوە نازینەتان لە چی‌یەوە هاتوە ؟

کاك ڕەئووف بە وەختو ناوەخت کوپلێتە شیعری شاعیرانی‌تری ڕیزکردوە • ئەگەر مەسەلە بەراورد بێ ، وابزانم بەراورد وانابێ • کە ێك ڕەخنەگر ئامـاژەی شیعرێك ئـەکات لـە باسکردنی بەرهەمی شاعیرێکی‌تردا ئەبێ ئەوە بە بخوێن بسەلمێنێت کە شاعیر کەوتوەتە ژێـر

(١٥) ئەم ستوونە لە مەیدانەکەی نزیك کۆشکی زستانەی قەیسەردایە لە لینینگراد •

(١٦) ئەم دێڕانە ئەوەندە بەناووبانگن ، بـە پێویستم نـەزانی نـاوی سەرچاوەکانیان بەرم ، وەك لە گەلێ شوێنی‌تریشدا سـەرچاوەم ناونەبردوە •

تەئسیری ئەو شیعرەوە ، یان کۆپیی کردوەو دزیویەتی ، یان شتێکی لەمبابەتانە ، ئەگینا ئەو هەموو لاپەڕەیەی بەو کۆپلێتە شیعرانەوە خەساری کردوون ئەیتوانی لە ڕوانگەی ئەو ( النقد البنیوی )یەوە کە باسی کردوە باسی شیعرەکەی منی تیا بکردنایە •• هەرچەندە بەلای منەوە ئەو ڕەخنەگرەی کە ڕوانگەیەکی ڕوونی هەبێ بۆ سەیرکردنی ژیان‌و خاوەنی فکرێکی دیاری بێ ، لە ڕوانگەی ئەو فکرەوە ، لە چوارچێوەی ئیستاتیکی ئەو فکرەوە سەیری هونەر ئەکات • ڕەخنەگرێکی سۆفیەتی دێت لە ناوەڕۆکی هەر بەرهەمێك ئەکۆڵێتەوەو پاشان دێتە سەر فۆرم‌و ئەوە بۆ بخوێنیش‌و بۆ خاوەن بەرهەمیش دەرئەخات کە پێوەندی دنیای نێوان ناوەڕۆك‌و ڕوخسار بەدیهاتوە یان ئەو پێوەندییە ئورگانییەی لەنێوانیاندا هەیە ، نووسەر توانیویەتی بە شێوەیەکی پتەوو داهێنەرانە بەدیی‌بهێنێ ؟ وتارێك بە قەڵەمی ڕەخنەگرێکی لەمبابەتەی من باسی ئەکەم هەموو ئەو مەرجانەی تێدا ئەبێت ، هەرچەندە بەکورتیش بێ ، باس لە هەموو شتێك ئەکات کە بۆ شیکردنەوەو هەڵسەنگاندنی دەقەکە پێویست بێت • بۆنموونە وەك کاك ڕەئووف خۆی باسی‌کردوە ، ئەبوایە لە مۆسیقای شیعرەکەو قافیەو ئەم لایەنانە بدوایە ، چونکە ئەمانەش شتی گرنگن‌و لە شیعردا لاوەکی نین • بۆ مەسەلەی قافیەش من لەگەڵ ئەودام ئەگەر بە زۆر لە خۆ کردن نەبێ پێویستە ڕەچاو بکرێت •

هەرچی ئەو ٨١ (من)ەشە ، ٨١ (ئێمە)یە •••

لە وتارەکەی کاك ڕەئووفدا هەندێ شتی‌تریش هەیە کە من سەرنجی تایبەتیی خۆمم بەرانبەریان هەیە ، بەڵام منیش درێژەم زۆر دایێ‌و ، ئەوشتانەش باس بکەم زۆرتری ئەوێت •

لە کۆتاییدا ئەمەوێ ئەوە بڵێم کە ئەم جۆرە وتارو لەسەریەکتری نووسینە ، ئەگەر بە گیانێکی مەوزووعی بنووسرێن ، شتی بەکەڵك بەئەنجام ئەگەیێنن و ، بەدەنگ هاتنی منیش وەنەبێ لەوەوە هاتبێ کە لەسەر شیعرێکی من نووسراوە ، نەء ! ئەگەر نووسینەکەش هەر لایەنی هونەریی بگرتایەتەوەو نەکەوتایەتە هەندێ ناکۆکیو موغاڵەتەیواوە کە من خۆم نەمتوانی لێی بێدەنگ بم ، بێدەنگ ئەبووم • بەلای منەوە ئەم جۆرە بۆچوونانە ڕاست نین • بۆیەشە هاتمە دەنگ • ئەگینا خـۆ کاك ڕەئووف وەسپی زۆریشی کردووم • من وائەزانم کە خۆم یەکێکم لەوکەسانەی زۆر بـە ڕەقیو تونـدی لەگـەڵ بەرهەمەکانـی خۆیاندا ئەجووڵێنەوە ، بە شێوەیەکی وەها ئەوا بۆ سێ ساڵ ئەچێ پارچە شیعرێکم بڵاونەکردوەتەوە ، لەگەڵ ئەوەشدا شتم زۆر نووسیوە • من حاشا ناکەم لە نووسینەکانی پێشووی خـۆم • نەء ! بەڵام ناشمـەوێ خـۆمدووبارە بکەمەوەو ، بەشوێن شێوەیەکی وادا ئەگەڕێم کە زووتر بگاتە بخوێنو بە شەرتێکیش لایەنی هونەریی خۆی لەدەست نەدات • ڕاستییەکەی لە چەند دەنگێکی دیاریش بترازێ شیعری ئەمڕۆی کوردی زوربەی دووبارە کردنەوەو خۆجوینەوەو بەکارهێنانی سـەدجارەی کۆمەڵە ڕەمزێکە کـە بەدەستـمانەوە گیریان خـواردوە • من ئەمەوێ بە گیانێکیترەوە ، بـە ڕوخسارێکی شیعریی ڕەونەقدارو نەمرترەوە بنووسم • ئەمەوێ ئەو خەمو ئاواتە کوردانەو مرۆڤانەیەی کە هەمە لە دڵی بخوێنی کورددا ، لای میللەت بمێنێتەوە • ئەمەش کارێکی زۆر قورسو ئاڵۆزە • ئەمەوێ شیعرەکانـم چاکتر دەربڕی ئازارو ئاواتی چینی زەحمەتکێشی کورد بن ، ئەو چینەی کە لە پشتی کەوتوومەتـەوەو کوڕێکی دڵسـۆزیمو ئەوەنـدەی خەمی گەورەو ڕقی گەورەو ئاواتی گەورەی پێبەخشیوم، ئەوەندە لە ئازارەکانیدا تواومەتەوە کە هەرگیز لێی جیا نابمەوەو هەر ڕۆڵەی بەوەفای ئەو ئەبم •

ئیتر باکیشم لەوە نی‌یە کە ڕەخنەگری وەك ڕەئووف بە زۆر ئەمخاتـە چ خانەو ئاپارتمانێکەوەو دڵنیاشم حوکمی ئەو چینەو مێژووش لە هەموو شتێ گەورەترەو ، لەگەڵ گۆرانی مەزنیشدا ئەڵێم :

**من سەربازی ئامانجێکم : پیرۆزە**
**فیداکاری ڕێگایەکم : بێ‌گەردە**
**ڕەنجێك ئەدەم ڕەنجی پیاوی دڵسۆزە ،**
**لە ڕێ‌یەکا بێ‌باك ئەمرم ڕێی مەردە !..**

ئەگەر میللەت بایەخ بە شتێ زیاتر بدا لە ئازادی ، ئازادیی لەکیس‌ئەچێ . خۆ ئەگەر ئەو شتە سامان‌و گوزەران بێ ، ئەوە پاش لەکیس‌چوونی ئازادی هیچی‌کەی بۆ نامێنێتەوە .

**سۆمەرست مۆم**

# سەرەتاکان

نەوزاد رەفعەت

پێش وەی مەولەوی
خاکی تاوەگۆز ئاوابکاتەوەو گەوهەر هەڵرێژێ ،
پێش وەی قوتیلەی
قەسیدەکانی حاجی قادری کۆیی دایبسێو تەمو تاریکیی
گومەزو حوجرەو دیوانەکانی کۆیە ڕاوبنێ ،
پێش وەی تیترواسك
جووتیان بزرکەن ، وێڵو نیگەران هەرداوهەرد بفڕن ،
فەقیانەی سوارەی شکاك لە خوێنی سمکۆ وەردرێن ،
هێشتاکۆنە شاخ
پڕ کۆتر بوونو تك‌تك هەنگوینیان لێ دادەچۆڕا ،
مامز ئێواران بێ‌سڵ کردنەوە
شۆڕدەبوونەوە سەر کانیو ئاوو دەشتی پڕ گیا .
شەوێك درەنگان ،
ئەو وەختەی جیهان ،
خامۆشەو سەوەر دێو سام دەنوێنێ ،
تەنیا گرمزنی نزیکی دوڵ دێ .

لەودیو کەوشەنو شتەکانەوە ،
لەودیو تەمەوە ،
دوو کۆترە کێوی ،
نە، جووتێ پەری
چەخماخەیاندا و تەلار بە تەلار
کوختە بە کوختە .. شاریان پشکنی ،
دوایی پێکەوە ،
لە تاقە کونی زنجی منەوە هاتنە ژوورەوە .
ئەوشەوە بوو کە گەیشتمە زنەی دوورترین کوێستان ،
ئەوبەری سووتان ،
لە وەرزی شەختەو
سەرماو سەهۆڵدا گوڵاڵەم ناسی ،
پێرووم لێ باری ،
شمشاڵ لەخۆڕا
کەوتنە لێدانی ئاوازی سەما ،
ئەستێرەی بن تەم چاویان هەڵێنا .
نەشمدەزانی شەنەی هەنگوینی
ماچومووچی شەو دەبێتە ژاراو
دڵۆپە ئاوێ دەکاتە لافاو .
شەماڵی فێنکی چەمی ڕامووسان
ئاوری دڵم هێندە خۆش‌دەکا
گشت پەرێزەکان بتەنێتەوە .
کوان ئەو کۆترانە ؟
جارێکی‌تر تۆم بۆ دەهێننەوە ؟

دەڵێن : « ئێستاکە چلووی زستانەو
کە تەم ڕەویەوە ، کە بەفر چۆوە
لەگەڵ بەیبوونو ڕێواس‌و خاوو
قازو قورینگ‌و شەنگەبیزادا دەگەڕێنەوە » .
من کاو توورەکە خۆڵو ژیلەمۆی
دڵی خۆمم بە کێوەکان وەرکرد
وتم : ئەوا شاخ ڕەشاییی تێکەوت ،
بەفری لێ نەما ،
خێڵەسات بەرەو کوێستان ملیان‌نا .
ـــ نەگەڕایەوە ؟
ـــ بە چنگەڕنێ ..
بە ڕێی پیرۆزیا سەردەکەومەوە .
بە ماهەکاندا هەڵدەگژێمەوە .
چۆن با دەگاتە شارە دوورەکان
ئاوا دەیگەمێ‌و دەیهێنمەوە ناو باوەشی والآ .
با منیش تاوێ تیشک‌و ڕووناکیی مانگم لێبدا .
پێش‌وەی قەدی دار
خاچ‌و بوازی لێ دابتاشرێ .
خانی لەپزێرین گەمارۆ بدرێ .
ئەو دوو پەری‌یە ..
. . . . . . . . . . .
بەسەر سەرمەوە لەنگریان گرتووە ..
من یەکەم جێژی لەشیم چەشتووە .
ـــ چاوی گورگی ڕێی خاکی خانوو زین

وێنەی قوتیلەی دەلاقەکانی دێهات دەسووتێ چۆنی دەگەیتێ ؟
سەدان ئاگردان دامرکانەوە پاش کڵپەو سووتان •
دەیان دارستان هەرزان فرۆشران •
ـــ گەر دار لە تەورو بڕین ترسابا بەرز دەبۆوە ؟
گەر کانی سڵی لە بەرد کردبا دەهاتەدەرێ ؟
بە کێو بڵێین بۆ
سەری سپیی خۆی لە هەور دەسوێ ؟
بۆ خۆی بە پەلکە چروو دەپۆشێ ؟
سەرێ هەڵبڕنو بڕوانن دوندێ سەرێ نەدیوە
رووبارێ ڕەوتو ڕێچکەی گۆڕیوە •
چۆن پیرە هەڵۆ وا بەئاسانی
هێلانەو بێچووی بەجێدەهێڵێ !
هێندەش بەخیلی بە شەپۆلی تیژ
چنگی دالاشو ترۆیك نابەم
بەڵکو بەوئاشقەی
پاش سەدەها ساڵ ،
بە ماشووقەکەی خۆی دەگاتەوە •
( ئەو ماینە تەنیا تاقە سواری خۆی
جڵەوو ڕیشمەی دەگرێتەوە دەست
تەنیا قامیشی حەزرەتی نالی
دەتوانێ زوڵمی دەوری ڕۆمییەکان
بکاتەوە بە شەنگترین هەڵبەست ) •
بە هەنیەکاندا هەڵدەگرێمەوە
ئەگەر لە داخی دووریشی مردم

ئەوا ئەو عەردەی بۆم هەڵدەکەنرێ دەبێتە ئاسن
تا لەتەك ئەودا نەبێ نەمنێژن
شەویش درەنگان
وەك یەکەم ژوان
هەموو ئاوایی دەنگ‌و شەقڵزنی
تێك ڕژانەوەو پێك گەیشتنەوەی
جەستەی عەودالو ڕۆحمان دەبیسن * ٠

١٩٨١

★ ئەم شیعرە هەندێ کارتێکردنی هەر دوو بەیتی مەم‌وزین‌و برایمۆکی پێوەیە ٠ ...

چیرۆك

# کارا دیزکا ڤیتخ

سەعیدی ئیبۆ

سەحیدێ ئیبۆ لە دێی جرارات ، لە ناوچەی ئیچمیازین، لە ئەرمەنستانی سۆڤیتی ، لە ساڵی ١٩٢٤دا لەدایكبووە ٠

لە ساڵی ١٩٥٠دا تێخنیکۆمی پزیشکیی تەواوکردووە ٠ لە ساڵی ١٩٥٧دا بە پلەی « زۆر چاك » لە ئینستیتۆی پزیشکیی یەریڤان دەرچووە ٠

لەپاش تەواوکردنی ئینستیتۆ ، وەك پزیشکێکی سەرە ، لە ناوچەی سیتاك ، لە ئەرمەنستان دەستی بە کار کردووەو بەدەم کارو ئەرکی پزیشکی یەوە ئەزموون و تەجرەبەیێکی چاك پێکەوەدەنێ و وەك پزیشکێکی خەمخۆرو دڵسۆز لادێ یی یەکان خۆشیان دەوێ و ڕێزی لێ دەگرن ٠

لە ساڵی ١٩٦٢دا ئاسپێرانتوورای ئەکادیمیای زانستی پزیشکیی لە تورکمانیای سۆڤیەتی تەواودەکاو کاندیدات وەردەگرێ ٠

سەحیدێ ئیبۆ هەر لە سەرەتاوە خۆی بە ئەدە بیاتیشەوە خەریك کردبوو ، شیعرو نوکتە شیعرو سەربهوردی دەنووسی و لە نووسینەکانیدا ناوی کەوتە ناوناوانەوە ٠

لەپاشان هێندێ شیعری لە کتێبی قوتابخانەکاندا بڵاوکرایەوە « وەتەنێ منراەی لە کۆواری « سۆڤیتەگان گراکانوتیون ئارفێست»ی ئەرمەنیدا بۆ بڵاوکرایەوە ٠ دووابەدووای ئەمە ، ڕۆژنامەی « ڕیاتەزە » کۆمەڵێ شیعرو

چیرۆك و نووسینی تری بۆ بلاودەكاتەوە. ئەم چیرۆكەی لێرەدا دەیخوێنیەوە یەكەم چیرۆكی كۆمەڵە چیرۆكێكی لەچاپدراوێتی ، كە لە ساڵی ١٩٦٦ دا بە ناوی « دورپیان »ەوە بلاوكراوەتەوە .

زۆرم بە پەسند زانی نموونەیێ لە چیرۆكی چیرۆكنووسە كوردەكانی سۆڤێت بخەمە پێش‌چاوی خوێنەوارو بنووس‌و چیرۆكنووسانی لای خۆمان‌و بزانین لەوێ لای ئەوان چ باسە ...

**شوكور مستەفا**

پانزدەھ ـ بیست‌ساڵ ژ وێ ڕۆژا ناڤ‌و نیشان دەرباز بووبوو ، وەختا ئەرمەنستانێدا قەیدێ سۆڤێتیێ هاتبوونە تەسدیقكرنێ . گوندێ مەدا ئێدی كۆلخۆز هاتبوو سازكرنێ . كۆچەرا تەركا عـەمرێ خۆی پەریشـان دابوون ، كەتبوونە كۆلخۆزێ ، عەدلیبوون ، بێ‌منەت دخـەبتین . ئەوانا ڕۆژ ب ڕۆژ ، سال ب سال حالێ خوە خۆش‌دكرن ، دبوونە خۆیمـال ، خوەیێ رزق ، خوەیێ كەدا حەلال ، لێ گوندییێ مە هنەكا مینا پێشیكێ خوەیە ژ ئێلا ئۆرتلا پێشەكێ خوە بیرنەدەكرن ، ئەو پێشە نە كێم ، نـە زێدە ، قاتخفرۆتان بوو، وەختا بەهار دهات ، لەیلانێ دلیست، ل دانگا دبوو بارینا كـۆزا ڕەنـگین ، كەڤانییا بەرۆشی خـوە هلددان ، هلكوتك ل میا دخستن . شیر ددۆتن ، قاتخ دمەیاندن ، مێـرا ژی ڕۆژترا دنێ ئـەو قاتخ دبرە شەھەر دفرۆتن . شـــوندا ڤەدگەرپیانە ماڵێد خـوە ، وەكی سفەترا دنێ دیسا قاتخ بڤنە شەھەر . برێد منە مەزن ، یوسف ، ئەسەد و عەمۆ ژی وی یالیدا ژ جینارا پاشدا نەدمان . وانا ژی قاتخ دبرن دكرنە پەرەو دانین ددانە دیا من .

ئەز وان چ'خا ئیدی ئێنجەیی مەزن بووم ، دچومە بەر بەرخێ مە • منزەعف ژ خوندنێ حز دکر • هەرڕۆژ ، وەختا ڕۆیێ نەدیر ددا ، من بەرخ بەرددان ، هەڤانا نانێ مندا خێنجی شەلبکێ قاتخ،تۆراڤا سیرمیکری و چەند نانێ سێلێ ، عەسە کتێبەك ، گازێت ، قەلەم ژی هەبوون •

ئەوێ سالێ بەهارێ بەرئاڤیت ، شلی ژی ب گـۆتنا وە دبـاری ، حەیوانێ دۆشانی تێر دخار ، گرێش تژی شیر دکر ، بەر ب مال دلەزاند، کو شیر بدە سەغەلێد بخوە • دیا من ژی مینا کەڤانیە دنێ بەرخارا شیر حەلال پارڤە دکر ، ئەوێ پەز سەردۆش دکر ، هنە شـیر ژی بـەرخارا دهشـــت •

رۆژکێ ، وەختا من بەرخ بربوونە چێرە ، دیـا من و برێ من ڤا شێورا خوە کربوون وەکی من ژی هینی قاتخفرۆتانێ بکن ، من ئێڤارێ بەرخ ئانینە دەعنا ، ئیدی هیڤیا کیسکرنێ نەسەکنم •چوومە مال و من سەر نیڤا خوە ڕاگرت • تەعریبێ ئیدی عەرد هلدچنی ، کوچکەکی تەڕکی ل بن هێشیا کۆنی مەدا دادان ، کولاڤ ژ گۆشێ ستێر ئانین دانین ، ئـەم سەر ڕوونشتن ، دیسا خەبەردانا مە دەست پێ بوو • لێ ئەوێ ئێڤارێ دیا من مینا خوە هەر جار دەرهەڤا سالا ڕەڤێو جەردا گـور حەسـۆدا گلی نەکر • ئەو فەگەڕیا سەر من ، خەبەردانا خوە ب ئەڤی تەهەری دەست پێ کر !

— سڤك ، لاوۆ ، سڤێ تو گۆتی قاتخێ مە بڤی بفرۆشی •

— قاتخێ چ ؟ لێ چما لاوکە چ پێشە نە ؟ — من برس کر و ناڤێ برێد خوە یەکۆ — یەکۆ هلدان •

لاوك ئیدی شکر ، ژ عەردێ حەتا عەزمین،هینی قاتخفرۆتنێ بوونە،

ڕێبازێکی زانستی‌یانە هەیە هەموو لەسەری هاودەنگن‌و پێرەویی لێ ئەکەن ، ئیتر مەیدانی «ئێمە» و «ئێوە» نی‌یە • ئەنجا منیش هەر بەپێی ئەم ڕێبازە هیچ دەسکاری‌یەکی وتارەکەی مامۆستام نەکردوە ، بەڵکو دەق وەکو خۆی بڵاوم کردوەتەوەو تەنها لە پەراوێزا هەڵەکانیم ڕاستکردوەتەوەو سەرنجی خۆم سەبارەت بە هەندێ برگەی دەربڕیوە ، ئەمەش وەك هەموو خوێندەوارێ ئەزانێ زۆری جیایە لە دەسکاری‌و مافی خۆمەو بەڵکو پێویستی سەرشانی هەموو کەسێکە کە ئاگای لە هەڵەکانی ناو وتارەکە هەبێ • دەسکاری ئەوەیە من بهاتمایە هەڵەکانی ناو وتارەکەی مامۆستام لابردایەو ڕاستی‌یەکانم بە بۆچوونی خۆم لەجێ‌یان دانایە کە خوێندەواریش وای‌بزانیایە مامۆستا خۆی وای نووسیوەو لەوکاتەدا لەوانەبوو منیش بکەومە هەڵەیەکەوەو هەڵەکەی من لەسەر مامۆستا حیساب ئەکرا • ئەنجا ئەوەش بڵێین کە وتار هەڵەی تیابوو ، ئەوە هیچ نەبێ هەڵەکانی بە کاری زانیاری دانانرێن ، چونکە هەر ( ڕاستی ) کاری ( زانیاری )یە •

٤ ـ ئەوا هیچ کە هیچ‌کام لەو کوردانەی لای مامۆستا کوردۆیێف خوێندوویانە کەرەستەی ڕاستیان لەبارەی ئەدەبی کوردی عێراقەوە نەخستوەتە بەردەستی تا لە وتارەکەیا نەکەوێتە هەڵەوە، با هەڵەکەش بچووك بێ ، خۆ خۆی ئەبوو پرسی بە ڕۆشنبیرێکی شارەزای کورد بکردایە لەوانەی کە لە سۆڤیەت بوون ، یا وێنەیەکی وتارەکەی بەر لە بڵاوکردنەوەی بناردایە بۆ شوێنێکی وەك کوردستانی عێراق چونکە ئەو خۆی ئەیزانی لە سۆڤیەت چەند بەتەنگ بڵاوکردنەوەی کەرەستەی ڕاستەوەن‌و چەند پێویستە ڕۆشنبیران بە بابەتی ڕاست فێربکرێن •

٥ ـ كاك جەمال ئەڵێ : « ئەگەر هـاتو كـوردۆيێف ڕۆژنامەی ( بانگی كوردستان ١٩٢٢ ـ ١٩٢٦ ) بكا بە گۆڤاری ( دەنگی كوردستان ١٩٢٢ـ١٩٢٦)چ لە مەسەلەكە دەگۆڕێ (بەگوێرەی) خوێندەواری غەیرە كورد •• ؟ » •

منیش ئەڵێم زۆر ئەگۆڕێ، چونكە لەوحاڵەدا چەوتی لە جێگای ڕاستی دائەنرێ •• بەڵام ئەی ئەگەر ڕاستییەكە بنووسرێ لـە قازانج بـەولاوە كێ چ زیانێكی پێ ئـەگا ؟ نەئەبوو كاك جەمـــال قەدری (زانیاری) بەمجۆرە لێكبداتەوە •

٦ ـ كاك جەمال ئەڵێ : «نازانم وەرگێڕ [ واتە : من ] ژمارە ٥٥٣ی ژیانی لەكوێ هێناوەو بۆچ سەرچاوەكەی نەنووسیوە ؟ بێگومان لە وتارێكی ئێمەی وەرگرتوە بە بێئەوەی ناوی ببا » •

كاكی بەڕێز ! ئەوە كاری من نییە وتاری خەڵك وەرگرم بە ناوی خۆمەوە بڵاوی كەمەوە هەر لەبەرئەوە كە زوربەی خەڵكی وڵاتەكەم ئاگایان لە سەرچاوەكە نییەو ، لەوەش نەترسم كـە سـبەینێ یـەكێ ڕائەپەڕێ دەسـتی خوێندەواران ئەخاتە سـەر سەرچاوەكەو ڕاستییەكە وەك بەردی ڕەق ئەداتەوە بە ڕووما •• من وتارەكەی كۆردوییێفم لە ١٩٧٨دا داوە بە گۆڤاری كۆڕی زانیاری عێراقو وتـاری ( ئێــوە ) لـە تەشریـنی دووهـەمی ١٩٧٩دا بڵاوكراوەتەوە • زیاد لەوەش بۆ ئەبێ كاك جەمال لایوابێ ژمارە ٥٥٣ی ڕۆژنامەی (ژیان) تەنها یەك دانەی لێ لەچاپدراوەو ئەویش لە ئەرخیفی تایبەتیی ئەواندایەو كەس نەیدیوە ؟ ڕۆژنامەی (ژیان) بەئاشكرا لە سلێمانی دەرچوەو نێرراوە بۆ ئابوونەكانیو لە بازاڕیشا

فروشراوەو ئێستاش ژمارەی لای زۆرکەس ماوە • ئیتر بۆ مەحاڵـە منیش یەکێ بم لەوانەی بەرچاویان کەوتوە ؟

٧ ـ سەبارەت بەوەش کە (بناغە) ڕاستە یا (بناخە) ، هـەرچەند ئـەم مەسەلەیە نە لە دوورو نە لە نزیکەوە پێوەندی بە بابەتی وتارەکەی کوردۆیێڤـو پەراوێزەکانی من‌و تێبینی‌یەکانی کاك جەمالەوە نی‌یە ، هێشتا زۆر سوپاسی کاك جەمال ئەکەم‌و ، من پسپۆڕی (فقة اللغة) نیم‌و (مەغۆلی)یش نازانم‌و بۆ ئەم بابەتە بە فەرهەنگەکـانی (زمـانە تورکی یەکان )دا نەگەڕاوم •

(٨) بەش‌بەحاڵی شیعری خوالێخۆش‌بووان عەبدولواحید نووری‌و شێخ مارف بەرزنجەییش ئەوە من نەم‌وتوە شیعریان نی‌یە ، وتوومە لە جیهانی ئەدەبدا وەك شاعیر ناویان دەرنەچوە • ئێستاش بە چاوی ڕەخنەگر هەر دووپاتی ئەکەمەوە عەبدولواحید نووری لە مێژووی ئەدەبی کـورددا بـە نووسەری کۆمەڵایـەتی‌و شێـخ مارف بـە چیرۆکنووس‌و ئەنجا بـە ڕەخنەگر و پاشان بە شاعیر دائەنرێ •

ئەمە بۆچوونی منە • بۆنموونە گۆرانیش وەرگێڕان‌و پەخشانـی جوانیشی هەیە ، کەچی بەر لە هەرچی بە شاعیر دائەنرێ •

(٩) بەش‌بەحاڵی ئەو پەرەگرافی پاکانەیەش کە کاك جەمال بە زمـانی کاکیەوە نووسیویە ، یـا کاکی بانـگی کردوە ئـەو ( تەصریحە ڕەسمی‌یە)ی داوەتێ ، ئەمەوێ دیسانەوە بڵێم : ئەی بۆ لە وتارەکەی مامۆستا کوردۆیێڤدا تەنها (اغانی کردستان )ەکەی دوکتۆر خەزنەدار ئەوەندە بەدرێژی لەسەری نووسراوەو ، کوردۆیێڤ ئەو هەموو

( مەعلوومات )ە ناڕاستەی لەمەر ( اغانی کوردستان ) لە کێ وەرگرتوە ؟

کێ مەسڵەحەتی لەوەدا بوە ئەو هەموو قسە ناڕاستانە بۆ سوودی دوکتۆر خەزنەدار بخاتە مێشکی مامۆستا کوردۆییڤەوە ؟ با بڵێین کۆردۆییڤ پێشتر بەهۆی (تۆما بوا)وە ئەو مەعلوومانە ناڕاستەی دەسگیر بوە ، بەڵام تۆ بڵێی ئەقڵ بیگرێ مامۆستا خەزنەدار لە ١٩٦٠ەوە تا ١٩٦٨ لەگەڵ کوردۆییڤ بووبێ‌و پێکەوە،لەجیاتیی مامۆستایی‌و قوتابێتی ، لە مەعهەدی ڕۆژهەڵاتناسی لە لێنینگراد (کاریان) کردبێ‌و ، ئەو هەشت ساڵەش ، وەك دوکتۆر خەزنەدار خۆی لە وتارێکیا نووسیویە لە سەرانسەری تەمەنی ئەو مەعهەدەدا (قوممەی ئیبداع) بووبێ لەڕووی بڵاوکردنەوەی مەعلوو ماتەوە بە جیهاندا ، کەچی بەدرێژایی ئەو هەشت ساڵە باسێکی ( اغانی کردستان ) نەهاتبێتەئاراوە تا مامۆستا مارف باسی ڕاستەقینەی ئەو کتێبەی بۆ مامۆستا کوردۆییڤ بکا •• بەتایبەتی کە مامۆستا مارف باسی هەرەوەزیی نێوان زاناکانی مەعهەدی ڕوژهەڵاتناسی ئەکا •• تۆ خۆت لەم مەسەلەیەدا سەرپشك بە کاك جەمال‌و قەناعەتی خۆت بۆ خوا بڵێ •• بڵاوکردنەوەی‌وتارەکەی کوردۆییڤیش لە ١٩٧٥دا هیچ ڕێ لەوە ناگرێ کە مامۆستا کوردۆییڤ لە سەردەمی بوونی مامۆستا مارفدا لە لێنینگراد نووسیبێتی ، یا هیچ نەبێ لەو سەردەمەدا کەرەستەی بۆ کۆکردبێتەوە •

(١٠) ئەمە هەمووی لەلایەك ، بەڵام ئەوەی کە من سەرم لێی سووڕ ئەمێنێ ئەوەتە کەسانی‌وا ئەبینم کە لەگەڵیان دائەنیشی هەزار غەیبەتی مامۆستا کوردۆییڤ ئەکەن‌و بە هیچ‌نەزان‌و شتی‌وای دەرئەکەن‌و تەنانەت

وادانانێن کە قوتابی بـوون لـە بەردەستیاو بـۆ منەت نانە سـەری ئەڵێن گوایە «کاریان لەگەڵ کردوە» ، بەڵام کە کەسێکی‌تر بەنیازی دڵسۆزی بۆ زانست هەڵەیەکی مامۆستا کوردۆیێف ڕاستبکاتەوە ، لێی ڕائەبەڕن‌و خۆیانی لێ ئەکەن بە پارێزگارو میراتگری مامۆستا •

هەرچۆن بێ من لە تێبینی‌یەکانی کاك جەمال زویرو ناڕەحەت نیم ، چونکە خۆم بە ڕاست ئەزانم‌و وەڵامیشم هەیە ڕەخنەکانی ئەوی پێ ڕەت‌بکەمەوەو متمانەشم بە تێگەیشتنی خەڵك هەیـەو ، ئیتر سوپاس •

خراپترینی ئەو خـراپانەی کـە دیکتاتۆزی ئەڵێ بۆ چاك‌کـردنیان هاتووم ، دیکتاتۆری‌یەتەکە خۆیەتی •

**ئەلبێر کامۆ**

# برووسکی ڕێگەو نقیشکی شەوان ..!

مەوحەمت بێخەو

**« برووسـک »**

هەندێ لە برووسک ئەترسن
ئەڵێن سووتانی لەدوایە
شریقەو دەنگی ناقوڵایە
ئەی نازانن لە شەوی تار
ئەبێتە رابەری رێبوار ؟
جار لەبەر ڕازی ئەم ئەرکەی برووسکی ڕێ
منیش کە سووتانم شەوێ ..!
بۆیێ پتر لە تیشکەکان
چەخماخەی برووسکم خۆش دەوێ .!

**نقیشکی شـەو ..!**

ئەڵێن شەو دەریای ئەندێشەو ڕازی خۆشە
دڵدارەکان بە سروەی خۆش ئەیدوێنن

ژوانی زۆری لێ دێتەڕوو
کانی هەنگوینی سەرخۆشە
بەڵێ .. بەڵام .. چاوتیژەکان چۆن ئەیبینن
وەك مەشکەیێکی گەورەیەو
پەنجەکانی ئاواتی ژین ئەیهەژێنن
بۆ قاوەڵتیی کلۆڵەکان لە شەفەقدا
تۆبە نفیشکی لێ دەردێنن ..! (۱)

**دەبانو پێنووس**

لەناو شاییی جەژنی بەهار
دوو تووڕەی کار ..!
پشدێنو گیرفانیان بڕی
فیقەی زوڕنایان نووساندو
پێستەی دەهۆڵیان هەڵدڕی
( دەبان ) جەوهەری بەش کردو
مەستی دەرکرد
( پێنووس ) هەستی ئەرکی پەخشیو تەمی لابرد ..!

**کاروانکوژە**

ئەڵێن کاروان شەوان زۆر جار
لە دەشتی کاکی بە کاکیو
هەورازی هەزار بە هەزار
بەهۆی ئەستێرەی کاتشێوێن

---

(۱) نفیشك : کەرە .

هەڵەتەو سەرگەردان بوە
تامی گوژارکی چێشتوە
بەڵام ئەمڕۆ بۆ ڕێی شەوان
بەهۆی یاقووتی زامەکان
ئەستێرەکان ..
دەبن بە سیوەیلی بەیان
ڕێبوارەکان دەڕۆن دەڕۆن
پەی بە دەشتو هەوراز دەبەن
کاروان‌کوژە   ڕیسوا دەکەن ..!

ئەگەر نیشتمانم بوایە ، ئەموت نیشتمان بێ ئازادیو سەربەستی دانامەزرێ ،ئەگینا ئەوە نیشتمان نی‌یە بەندیخانەیە .

**مەحموود دەروێش**

چیرۆك :

# دەبوو بێنەوە یـاد

ئەحمەد سالار

ماوەیەكبوو سەرقاڵی بەكوردی كردنی چەند پەڕەیەك بووم لـە كتێبی بیرەوەریی ماموستایەكی مەزنی هونەری شانۆ ، تەنها پاكنووسی مابوو ، چەند شەوێكم بۆ تەرخان كرد • ئەم شەوەش وەك ئەو شەوانە ، زۆر مەبەستم بـوو ، گەلـێ ماناو وێنـەی جوانـم تیا دەبینی لەناخـەوە خۆشمدەویست وابزانم لـە خۆشەویستی ئـەوەوە بوو • بە هـەرحاڵ وورووژاندمی ، بەرەبەرە ڕەنگە گەرمەكان ساردبوونەوە ، گەورەكان لە بازنەكەی مندا بچووك دەبوونەوە ، هەموو •••• یەك وێنەی دەنەخشاند، تەنها تابلۆیەك ، تابلۆ و چوارچێوە ، خۆمو ئەو دەوروبەرە ، ڕێگاكانی من دەچنەوە سەر یەك شوێن ، بانەو ڕۆمای من ، هەر چەپكە تیشكێ بێ ، لە پەنجەرەكەی مندا پەلكە زێڕینەیەكی دیی لێوە دێتەدی ، هەر كانیاوێ ئەتەقێتەوە ، سەر هەڵدەدا ، سەوزدەبێ ،•••• هێی •• هێی ، كابرا ! لەكوێی ؟•••• تۆ ، بەڵێ ، گلەییم لێ مەكە ، سەواو مامەڵەو چەندوچـوونی لەسـەر نـاكرێ ، تـەرازووی ڕاستەقینـەو بپێـوی ڕەنگەكانە•••ئەگەر ئەو كلۆڵە ناچار هاتە سەر گێڕانەوەی كەساسییەكەی بۆ ئەسپەكەی ، بەخوا ئەوا من بۆ دارو بەردیشی دەگێڕمەوە ، ئەمەیان مافی ڕەوای خۆمەو كەس ناتوانێ ڕێگام لێ بگرێ ، تۆ بڵێی ئەمەش بێ بـە • ••••

بەدەست خۆم نی‌یە •••• بۆتە خولیا ••• ماخۆلانی پێ خستوم ، بە کورتی‌یەکەی ئارەزووم لەو سووتانەیە •••

— گلاراوتە •

— لەخوێنما سەوز بووە ••• چەکەرەی کردووە ، نەمدرکاند ، هەر بردمەوە دڵی‌خۆم ، ئای کە دڵێکی گەورەبوو ••••

— ئەی ئەو ؟

— ساڵی یەکەم ، دووەم ، چوارەم‌و تەواو •••

ئەمڕۆ بەڕێکەوت پێم‌زانی ، ناوی تۆم برد ، وتم ئامادەم ( نەبەخوا هەرچەندە زۆرم پێ بوو بەڵام ) •

— تۆ بڵێی ؟

— خۆت مەخەرە داوی سەرئێشەوە ، تا زووە ئەو خەیاڵە لە کەللەت دەرکە •

( بۆ دەیەمین جار گفتم‌داو ، بەڵام ••• ) •

لە سەرسنگما کۆبوونەوە ، قورس‌بوو ، کاتێ ئاوڕێکم دایەوە :ـ

— وانەڵێی •

— قابیلە درۆت لەگەڵ بکەم •

کۆتایی نایە ، مەگەر هەر خۆم بزانم چەندە دوورو درێژە •••

— حەزئەکەم پێ‌بکەنم ، تا قاقا لێ‌بدەم ئەهوەنتر دەبێتەوە •

( ئەوە پیشەمە ، بەڵام پێکەنینی ئەم‌جارە لە جاری جاران ناچێ )•

وتی : لە کوێستانێکی زۆر دوورا ( ئەمەیان چیرۆکێکی کۆنە )

باڵندەیەکی تیسك‌سووك دەژیا ، جا ئەو باڵندەیە چ دەنگێکی لێوە نەدەهات، نە خوێندنێ .... ئەوەی خەلکەکەی حەپەساندبوو بریتی‌بوو لە پیشەی هەمیشەیی بەیانیانی ، بەر لە خۆرهەڵهــاتن ، هێــلانەو لـق‌و چــڵانی جێ‌دەهێشت ، هێندە دەفڕی باڵەکانی لەوەدابوون بکەونە گڕگرتن ، تا دوا ترۆپکی بەرزو باڵا ، ئەوسا لەســەر ئەو بەرزە لووتکانەوە ڕووی‌دەکردە خۆر ، گزنگەکانی لە چاو دادەنا ، دادەگیرسا ، زۆر بە بێ‌دەنگی ، لەگەڵ ئەوەشدا گشت خەلکەکە ئاگاداری بوون ، بۆیە لەتەك هەموو هەڵهاتنێکی خۆردا باڵندەکەی بەبیردا دەهاتەوە :

ــ هەموو دونیا قسەم بۆبکا من ئەڵێم بەوخوایە شەیدای خۆرە .

ــ جا کەواتە بۆ لە خۆرا هێلانە هەڵنابەستێ ـ ها ؟

ــ گڕئەگرێ ... پەڕو باڵی دەبێتە زوخاڵ .

ــ شێت‌و شەیدایە .

ــ پاك‌و بێ‌گەردە ، عاشقە ، فریشتەی خوای لەگەڵدایە ، ئەگینا ... ( ئەمە وتەی سەرزاری دڵدارە هەرزەکارەکان بوو ) . بەحەیران دەوترایەوە ، لە چەپکە هەڵاڵە کێویلەی بەرۆکی دەستگیرانــە شۆخ‌و شەنگەکان جوێ نەدەکرایەوە . ئەی نەوجەوانی جاران ، دڵدارە بەساڵاچووەکان ، ئەوانەی سەد دەستی شکاویان لە ئەستۆی چاك‌بوونەوە نابــوو ، ئەوانــەی هــەوارو هەوارگەیان بە بۆنــی مێخەك‌بەندو زڕەی بازن‌و هاڕەی هەیاسەدا دەناسی‌یەوە ؟.

ــ ئێمە دڵ‌نیاین لە پەڕو باڵ سووتانی ، بەڵام سەد ئافەرین بۆ هونەری قاڵبوون کە نایەڵێ ناحەزت پێ خۆش بێ .

وەرز :ــ ئەوا سبەینێ نەورۆزە ( بەیانی‌یان لە نیوە شــەوەوە

ئاسمانێ ڕەنگی نوێی نەبینراو لەدایكدەبێ ، جیهانێ دەنگو وشـە ، زمانێکی نوێ ، دەنگی ناخۆش نامێنێ ... نامێنێ ... نامێنێ ... ) ڕەنگە نوێیەکان بوونە هەوێن ، بوونە کێڵگەو بوونە بارانیش ، لـەو جیهانە ڕەنگینەدا ، فڕی فڕی ...

ــ بە منالی بیستوومە .

ــ یەکەم ڕۆژی قوتابخانەم بوو ، شارە خنجیلانەکەمان دوو قوتابخانەی تیابوو ، ئەوەی منیان تیادا ناونووس کرد کەوتبووە خـوارەوەو ( مامۆستایەکی زۆر گەورەو منێکی زۆر بچکۆلە ) .

ــ هانێ ئەم تەباشیرە ڕەنگاوڕەنگە جوانانە بگرە .

سوور ، زەرد ، شین ، . . . . . .

هەموو ڕەنگەکانی جیهان ڕەنگدانەوەی ئەو چوار کلۆ تەباشیرەیە، ئای کە جوانبوون ، ویستی لەو ڕەنگانەوە قوتابخانەم لا شـیرین کا ، نەیزانی پەلکە زێڕینەو ئاسمانی ساماڵو دەریای بێ سنوورو چاوەکانی تۆشـیان بێ ناساندم .

( نازانم بـۆ بەسـەرهاتی باڵندەکـەو بیرەوەرییەکانی مامۆستا هونەرمەندەکە کە خۆشەویستن لە ژیانی بێسکاڵامەوە ئەئاڵێن ) .

هەر لەو ڕۆژانەی منالیمدا بوو هەورەبانی باڵەخانەیەکی گەڕەکەکەمان وەڵامی گەلێ پرسیاری بۆ دەدامەوە ، وامدەزانی خۆر ، هەور ، مانگ، لەوێوە هەڵدێن ، زۆر بە بەرزم دەزانی ، تۆ بڵێی ماڵی خۆشەویستەکەم بووبێ . ئەمەشیان با بمێنێ ، لە منداڵیدا شتەکان بچووکنو بە گەورە دێنـە بەرچـاو ، لـە گەورەیـیدا بچـووك دەبنـەوەو ڕاستییەکەیـان

دەردەکەوێ ، بەڵام لە بیرەوەریدا گەورە دەبن ، ئەو هەورەبانە شوێنی باڵندەکە بوو ، ڕۆژێکیان ، فڕی ، فڕی تا خوا حەزکا، لە چاو ون‌بوو؛ چاوەکان کەوتنە ڕەشکەو پێشکە ، باڵی گڕگرتوی گەیاندە دوا خشتی گومەزی ئاسمان ئەوسا چی هەوا هەبوو فووی‌کردە سینگیەوە بە چریکانێ کردیەوە دەرێ ، تا توانی ، تا گشت زەنگەکانی زرنگاندەوە ، دەبوو ئەو گۆرانی‌یە بچریکێنێ ، دەبوو ئەم بیرەوەوەری‌یانە بێنەوە یاد •

**ئایاری ١٩٨١**

پیاوی لەخۆبایی لەو کەلەشێرە ئەچێ کە وائەزانێ ڕۆژی سبەینان بۆیە هەڵدێ گوێی لە خوێندنی ئەو بێ •

**جۆرج ئیلیووت**

# خەوی خەندە

**دلپاك طاهر كاوانی**

ئاخ دایە گیان ؛
گەر ئەزانی کۆرپەی ژانی
بێشکەی سینەم ، چەند گرۆکە !
دیاریی دەوێ •• زەردەخەندەی لێوەکانی
توّی لێم دەوێ •
شەو تا بەیان بە لایلایەو ئاوازی خۆش
لەسەر نوێنی ئارامی دڵ دەینوێنم ••
کە لە ئاسمانی دەروونما ؛
بە سەدان ئەستێرە گەشەی جۆراوجۆری
بۆ دەهێنم ،
ئەوسا دەڵێ : خۆرم دەوێ •• مانگم دەوێ !!

× × ×

ئەی دایە گیان ؛
وشە نەما لە فەرهەنگا

نەیکەم بە گەردانە شیعر بۆ گەردنە بێ گەردەکەت ..
بووم بە باران تنۆك تنۆك ڕژامە نێو دەروونتەوە
کێڵگەی پاکی دڵم کێلاّیت ..
گوڵی ئاڵی گۆنام چنیت ..

× × ×

بەڵام دایە !
نازانم بۆ جارێك .. تەنیا جارێك نەمدی
خەندەی لێوی وشك هەڵاتووت
وەکو کانیی بەهارانی وڵاتەکەم
لە ناخی دڵتا هەڵقوڵێ ..!!
ساڵ هات‌وچوو ...
بووکی بەهار تارای سووری لە ڕوو لادا ،
کەچی دایە ، ڕووباری چاوەکانی تۆ
هەر دەڕوات‌و .. هەر دەڕوات‌و .. وشك‌نابێت
تا درەختی زەردەخەنە لە کەناریدا شین دەبێت .

# گوڵی گلێنەی چاو

جەلال مەحموود عەلی

سۆڵەی رەشەباکە لەبەر سەموونخانەکەدا هەموانی بێچاوەتەوە .
برووسکەی تەلی دڵ لەگلێنەی نەسرەوتەوە چەخماخە ئەدات ، گیان
ئەهەژێنێت ، ئاگری خەرمانی هۆش خۆش ئەکات .

تاڵێك ئەگریجەی یاخیی کچە خاڵکوتراوەکە ئەئاڵێتە گەردنی
حەمەتاڵ ، بۆ پێدەشتە گەرمەکە بەکێشی ئەکات .

« گەر هەموو رۆژێك تەزووی تیلەت ختووکە بە گیانی شپرزەم
نەدات ، لافاوی خوێن نهێنیی ژیانت لا نادرکێنێتو ژیانم بۆ نابڕێتە
سەر » .

شوێنەکە جەنجاڵە ، سۆزیش پەروای نی‌یە . بازی تاسە چنگی لە
نێچیری یادی حەمەتاڵ گیرکردووە . « تیلەی چاو ئەتگرێتە باوەش ،
تۆیش خەمی من بەسەرئەکەیتەوە ، بە یاد دۆستو بە گیان ئاشنا ، سەد
تەل پێکەوە بەندی کردووین ، شێوەت هی خاوەرە ، بۆنی ئەوم پێوە
ناویت » .

ـــ خاوەر مامۆستایەك بۆتە هاوسێ ، ئەشێ میوانداری‌یەکی بکەین . بەو
دەنگە ناسکە .

— دایە میوان ئازیزە •

« ئەو رۆژە نەورۆزو بەهار بوو » •

هەر رۆژێك خاڵ کوتراوەکە نەهاتایە ، چاوی لە ڕێگەکەدا ئەڕوا ، پەلی بۆ هەموو کۆڵانو لایەك ئەهاویشت ، تا درەنگ •••• بەشکو •••!!؟ • خاوەر هاتەوە بەرچاوی •

— بۆ تۆ وا ئەزانیت هەر تۆ دڵ لەسەر پشکۆیت ! ؟ ئەی تۆ خۆشەویستی براکانم نیت ؟ فێری ژیانیان ناکەیت ؟ تۆ لە گلێنەو دڵدایت •

زەنگی سۆزی قاقا ناسکەکەی خاوەر لە بەهەشتی ناخدا دەنگ ئەداتەوە • زەردەخەنەیەکی کاڵ بەلێویەوە ئەنیشێتەوە • نیگایش ئەئاڵێتە نیگای چاوە کاڵەکانی خاڵ کوتراوەکە • ئەویش بزەیەکی چاو ئەیگریت •

تاقمێك بە هاڵاوی تەندوورەکە لە کونی دەرگاکەوە خۆیان گەرمئەکەنەوە ، تاقمێکیش لەدەرەوە بە قسە •

— لافاوی چلەی هاوینی ساڵەکەت وەبیردێت کە لە وێڵەدەر بێشکەی بەکۆرپەوە ڕافڕاند ! ؟

— چیتە مام سمایل بۆ وا شپرزەیت ؟

— ڕۆلە لێڵاوی لافاو شوێنەواری لە پێدەشت بڕی • فریاکەون دەخیلتانبم « ئێمە زوو چوینە سەر باسکەکە •

قوتابخانەکە لەگوێ چەم بوو ، هەر زوو شوێنەواری بڕا ••• مامسمایل بەکوڵ ڕیشی چەرمووی تەڕئەکرد » •

ــ ئەی ماڵی وێرانم ... ماڵ ... ژن .. پیر .. گەنج چوڕاوێکی خەستە . پشیلە جوانەکان ئەمیاوینن ، توولە بۆرە ئەقوورووسکێنێت بێخاوەن . مالاتو ئاژاڵەکان بەشوانەوە .. بەندەکان پساون .. چ مەینەتی‌یەکە .

ــ بابە ئەسپەشێ بەسەر ئاوەکەوە چەپۆکانیەتی .

ــ حەمەوەیس کوڕە نەچیت .. رۆڵە لیتاوی لافاوەکە ئەتخنکێنێت .

ــ دایە خۆ مەلەوانم . هەر ئەبێ بیگرمەوە . ئەسپەشێ لە خـــۆم ئازیزترە . بەسواری ئەسپە شێوە ئەتانگەمێ .

ــ کاکەبرا دەستم دامێنت ئەوە حەمەوەیس ... تویش !!؟

ــ دایە بەفریایان ئەچم . من لەوان مەلەوانترم . بەسەر پشتی ئەسپە شێوە ئەگەڕێنمەوە .

« فرمیسکەکانت جەرگی بڕیم ... هەزار ئاوات ئاخی کەڕواوی بەرگی تێ گرت » .

رۆژ هـەڵات ، تاڵـە زێڕینـەکەی پشـتی سەموونـکرەکانی گەرم کردوە .

« بەرامەی سمڵو مێخەکەکەت لە رۆژهەڵاتەوە هات. کۆتی کردم، وتیان ئەوەی تۆ عەوداڵیت لە رۆژئاوا گیرساوەتەوە ، بەرەو ڕۆژئاوا ، بەرەو ژوور ، بەرەو خوار ، لە هەموو گوێ چەمێك ، لە هەر چوار لای جیهانەوە بۆنی ئـەهات ، ئـەبێ لەکـوێ بێـت !!؟ لـە هـەموو شوێنێك !! ؟ » .

چاوەڕێی سەموون زۆری خایاند ، نیگـایان باوەشـــی بەیەکـدا کردەوە ، بەتاسەوە .

ـ مالْتان ئەبێت نزیك بێت ؟

لەچکەکەی لەسەر دەمی لادا .. دەمو لێوی خاوەری پێوەیە ، .. بەناسکی‌یەکەوە وتی : بەڵێ

ـ خوزگە خاوەر بەئاوات ئەگەیشتین ، ئاسۆری هەمیشەیی سارێـژ ئەبوو ، جا کـێوی گەنممان لەم دەشتە هەڵئەدایەوە ، جا گشـت ئامۆزاکانمان تێ ئەرژاند .

ـ من وەك تۆم بە منداڵی دیبێت ... تۆ ... !؟

ـ ئەی تۆ چیی خاوەریت ... ؟ ... لەکوێ‌یە ؟ .

چاوە کاڵەکانی نوقمی گۆمی فرمێسك بوون .. ڕووی وەرگێڕا ، باشان چرپاندی .

ـ ئامۆزا سوێنی بۆوە .

ڕۆژێـکی‌تر

تۆ ئامۆزای خاوەریت .. هی‌منیشیت .. پێکەنی . باسم بۆبکە .

ـ مام سمایل پیر بوو بـەرگەی نەگرت ، کاکەمەم تـازە هەڵی‌ئەدا دەربازی کردن . وەك پیرەکان ئەیگێڕنەوە هەر سەد ساڵەو جارێك تۆفانێـکی وا ڕووئەدات . شوێنەوارەکان ئەبنە زرێبار ، بەڵام وردە وردە ئـاوی زریبـارەکە بەئاسمانـدا ئەچێـتو خەڵـکەکە ئەگەڕێنەوە شوێنی خۆیان . لیتەکەش ئەبێتە پەین بۆ زەوی‌یەکان .

لەگەڵ گێژاوی بیرەوەریدا هەناسەیان ئاڵایە یەك ، بریسـکەی چاو بنچینەی ئاسوودەیی دڵی هەڵتەکاند . پیکەنی .

ـ ئەی تۆ ئەبیتە دەستگیرانم ؟

ـ بەمەرجێك کە لیتاوەکە نیشتەوە بگەڕێینەوە دێکەی خۆمان .

ـ بەهەشتەکەی منیش پێدەشت ئەبێت .

# هۆرەی سیامەند

مارف عومەر گول

به «سیان»ی دڵی منا سەرکەوتیت و
شوێن پێت جێ‌هێشت
بۆ سەر شاخی چ دەربەندێ تەکانت‌دا
وا ڕۆشنایی گلێنەکەم جێی‌نەهێشتی ؟!
ماندوویی ناو بەردەڵانی کارەساتیش
منی لەبیر نەبردیەوە ،
هەر لە گەڵتام .. شۆڕبەرەوە
به لاولاوی بیری منا وەرە خوارێ
دە بزانە دەگەیتە کام سەوزەڵانی بنار شاخ و
دەشنێیتەوە وەك شنەبای زەردەپەڕی دەم‌ئێوارێ
گوڵاڵەی باخ .. نەمامی چەم
دێنە سەر ڕووی تەمی خەستی هەینەی شەوە بێدارەکەم
بێ‌ئەوەی ڕوو لە هەورازی بڵند بکەم
ڕێ هەورازە و منیش شاخم

دەبینم چۆن زەوی لەژێر پێی ستەما دەبێ بە خوێن
شاخیش شانی شەکەتی خۆی بۆ ستەمی ئەم سەدەیە دانانوێنێ
من نامەوێ بە گریانی مانەمینیی چاوی کچێ بێنیشێنم ،
لە توولەڕێی مەرگەساتا
چاوێ هۆشیار نەبێتەوە .. با بسووتێ
دڵێ بێدار نەبێتەوە .. من بۆ چیمە ؟!
ئێستاش گیانم هەناسەی گشت
شەوەڕێگای شاخەکانی هەڵگرتوە
شاخێ ڕەگی دڵو گیانی لەناو ناخی زەویدا بێ
قەت دیوتانە ، لەبەر کۆشکی زۆرداری‌یا
هەرەس بێنی !

× × ×

وا گوندەکەی ( مەولەوی )یشمان بوو بە نەبوو
بڵێسەی ئەو وێرانەیە گەیشتە لام .. بەئاسمانا نەهات بۆ لام
« لە کوێوە هات ؟! »
بەناو دۆڵو چەمەکانی کوردستانا
بەسەر پشکۆی ئاگردانی ناخی (خەجۆ)ی نیشتمانا
هاتو هەمووی بە گڕ سووتاند
منیش برژام ،
وەکوو قەقنەس منیش سووتام .

× × ×

بۆچی کۆتی توورەی ڕقتان لە گەردنی
لاولاوی ناو سەوزەڵانی ئەم زەوی‌یە دەئاڵێنن ؟!

بۆچڕنووکی ناحەزیتان لە کەمەری چیای گیانم گیردەکەن و
هەرچی قینی ناکەس بەچەی مەرامتانە
بەسەر گوڵو هەڵاڵەی ناو مێرگەکانی دڵی منا دەبارێنن ؟ !
ئەوە بۆچی گوێ بەندەری شنەی هێمن
وەك کەناری پەشۆکاوی لافاو وایە ؟!
خەڵکە سەیرکەن
هەرچی یاساو سنوور هەیە تێك ئاڵاون !!

× × ×

سیامەندم
لە وڵاتی تووڕەبوونا
هەواڵی ئەم گوێ بەندەری تووڕەبوونە
بۆ ڕێبواری هەواڵ دەبەی ،
بەدوای برووسکەی دەنگتا وێڵم
لە گشت لاوە برووسکەت دێ
کلیلەی شاخ ڕێگام نادا پیا سەرکەوم
«جارێ ، دووجار .. دەجار ، سەدجار
پیـا سەرکەوە ،
چی سەهۆڵی ڕێگا هەیە
لەژێر پێتا دەتوێتەوە » .
قەت لە زەوی و چڵی درەخت بێزار نابم
کێ هەناوی ئەوینەکەم لە پەل و پۆی درەختی ناو

ڕەزی تەمەن دوورخاتەوە ..ماڵی دەڕمێ
ئەوەی دەستی ناپاکی بۆ خاك درێژ کا
یەك‌یەك پەنجەی لێك‌دەترازێ‌و هەڵدەوەرێ .

× × ×

سیامەندم
وەك سێبەری بەر ڕوانگەی ئەوبەری گوند
تاقێ بەسەر گەڵای داری کەنار چەمی ( ڕۆخانە )وەی
تاقێ کەم‌کەم لە تەمەنی مۆمی باڵات دەتوێتەوە
جارێ دەڕۆی
چەم دەبڕیت‌و بۆ گوندەکەی ئەوبەر دەڕۆی
جارێکی‌تر جامانەکەت لە ملتایەو
بەسەر گردو تاشەبەردا سەردەکەوی
ساڵانێکە وەك خانەزای خەمی وا ڕووت پەشێواوەو
شەوچراغی ڕێگای دووری هات‌و نەهات
بەدەستەوە ناکوژێتەوە .

× × ×

لە هەیوانی خۆمانەوە چاوم لێ بوو
لەگەڵ تەمی پاش‌بارانی پایزێکا
هەور نیشتە سەر سابلاخ‌و دونیای داپۆشت
هەرچی نامەی دڵداری بوو
دەستیان لە مل نامەی دووری ڕێبوارێ کرد

نامە تك‌تك توایەوەو بوو بە ئاوی
مەتارەی ڕێی ڕێبوارەکە
ئەو ڕێبوارەش سیامەندی ولاتێکە
لە ناو تەما بۆ تروسکەی خۆر دەگەڕێ .

× × ×

دیدەی گەشی بالآی بەرزم بەسەر لەپی ڕۆژگارەوە
دێت‌و دەچێ .. ناگاتەوە هەوارگەی خۆی
هەوار کانیی تینوێتیی خۆی
ناردۆتە سەر ڕێی کاروانێ
کاروان هۆرەی دەگاتە گشت بەرهەیوانێ
هەیوانی مـاڵ
وەك (سەیوان)و (شەهیدان)ی هەردوو دیدەم
گریانی گشت ئەم گەردونەی لە پێڵویا حەشارداوەو
ترووسکەی خۆر
پێکەنین‌و گریانمی کردووەتە گۆرانی‌یەك
جی شەبۆلی شنەبایـە
لەگەڵ خۆیا هەڵی‌دەگرێ‌و وەکوو خۆزگە ،
نابڕێتەوەو دوایی نایە .

چیرۆك :

# گرێیەك لە دەروونی مام باپیردا

**تاها عەزیز**

لەگەڵ دەستبردنت بۆ قۆرییە ڕەشداگەڕاوەکەی سەر زۆپاکەو داخبوونی پەنجەی ئارامی ناخت .. لێکدانەوەت وروژا ..

«ماڵی وەستا کەریم ئاوابێ .. سوکنای کردمو ئەمکارەشی دامێ.. دەنا ئەبوومە مەخسەرەی ئەم دنیایەو سواڵکردنیشم پێ ڕەوا نەئەبینرا..»

وەکو سەرتاپای گیانت دەرزی ئاژن کرابێ ئەوەندەت سەرمای ئەوڕۆژە چەشتبوو، دەستت بوایە دیوارە سوورهەڵگەڕاوەکانی زۆپاکەت. ئەکردە پێستێکی‌دی بۆ لەشە بەساڵاچوەکەت ..

« وەك پیاو بە تووتن‌و ڕەزەکەم ئەژیام .. دەستخواری کەس نەبووم .. بەمعومرەشەوە نەئەکەوتمە ئەم هیلاکەتەوە ..»

تاریکی تا ئەهات گەشەی بە گڕی پەرەمێزەکان ئەدا . هەندێ کون‌و وردە درزی کۆخەکە مابوو بگیرێ . گفەگفی بارەش‌و ، وڕەی پەرەمێزەکان .. ببوونە قەبارەیەکی سامناك لە بەرچاوی سەرنجتا ، ئەوەندی‌تر گرێی بیرکردنەوەیان لە دەمارەکانی مێشکتا ئاڵۆزکردو دەرگای کۆخەکەیان پێ کردیتەوە ..

« لەدوای نوێژی عەسرەوە پێم‌کردوە .. ئەم بارەشە لەعنەتی‌یە چبوو .. تازە کورەی یەکەم دەم‌ئەدا ..»

جووڵەت خستە پەرەمێزەکانو ڕێکت‌خستنەوە • سەرکەوتیتە سەر کوورەکانو چەند خاکەنازێك خۆڵت دایەوە بەسەر بەردە بەیەکاچووەکانا، تا گڕەکە هەمووی بدەمێنێ • ڕووت وەرگێڕاو چاوێکت خزاندە نـــاو کانە بەردەکەوە • ورد ورد لوورەیەکی نزیکی نەسازو هەمەجۆر ئەیدا بە پەڕەی گوێتاو ترپەترپی دڵتی زیادئەکرد ••

« لە دەنگی ئێوە ناترسم •• باش بوو ئەم کۆخەم دروست‌کرد •• دەنا ئەبوو هەموو شەوێ •• پاپیرێکی وەك من لە گەڕانەوەیدا •• لێرەوە بۆ کۆیە بەدەستی ئەنقەستی ئێشـك‌گری سەر ئـەو دوو گردۆڵـکەیە لەناوچوایە •• »

ڕووت بـە لای گڕی هـەردوو پەرەمێزەکەدا وەرگێڕاو هاتیتـە خوارێ ••

« ئەگەر وانەئەبووم •• بـە تاپڕە نێـژراوەکەم •• لوورەم لـە چەقەڵو مێردەزمەکانی دیش ئەبڕی •• »

بەرمیلەکەت لارکردەوەو ســەرو تەنەکـەت کردە ناو تەنـکی پەرەمێزەکانەوە ••

« تا ئەمەش ئەســووتێ کوورەکانیش ئـەدەمێو ئەوجا پشــووی یەکسەری شەوی بۆ ئەدەم •• »

دەرگا شەقو شرەکەی کۆخەکەت کردەوەو خـۆت‌دایەوە بـەر گەرمای زۆپاکە • قۆرییە ڕەش‌داگەڕاوەکەت خستەوە سەری • دەستت دایە کەللە شەکرەکەو کەوتیتە وردکردنی ••

« ئـەگەر مـۆرم نەکردایـەو گیرفانیشـم لەســەر ئەو کاغەزە

خوێن‌خۆرانه داخستایه •• چیم‌لێ‌ئه‌هات •• هه‌روه‌ك ئێستا ئـه‌بووم •• ویژدانیشم بریندار نه‌ئه‌بـوو •• »

شه‌كرشكێنه‌كه خۆی خزاندو یه‌كێك له په‌نجه‌كانتی بریندار كرد••

« گۆڕی خۆم فرۆشتو خوێنی خۆم ئه‌خۆم •• تا نووزه له پاره ڕیسواكاره‌كه‌دا مابوو كرێ‌گرته‌و هیچ سه‌رێكی خۆم بۆ جیانه‌ئه‌كرایه‌وه• ئه‌وه‌شی مایه‌وه له (خاڵ‌خاس)دا به‌ڕێم‌كرد •• »

چه‌ندجارێـك له‌ســه‌ریه‌ك په‌نجـه برینداربووه‌كه‌ت مژی‌یه‌وه‌و خوێنه‌كه‌ت تف دایه‌وه به زۆپاكه‌دا ••

« ئـه‌و پاره‌یــه‌م وه‌رنه‌گرتایــه‌و له‌گــه‌ڵ خاپووربوون‌و پـه‌رش‌و بڵاوبوونه‌وه‌ی خه‌ڵكی دێدا •• وه‌ك ئێستا كرێكاری لای وه‌ستا كه‌ریم بوومایه چاكتر بوو •• نه منی به ساڵاچووی گه‌یانده هیچ •• نه خاڵ‌خاسی ئازیزی چاك كرده‌وه •• نه‌خێر •• نه‌خێــر •• ئه‌ویش له ئـازاری دێ ڕووی‌نا به‌ودەردەوە •• »

په‌ره‌مێزه‌كان كه‌وتنـه پرته‌پـرت ، ڕووناكی‌یـه‌كانیشیان كه‌وتنـه چاوداگرتن له‌و تاریـكی‌یه‌و ته‌نیاییــی شه‌وگاری بێ‌شــه‌رم • لووره‌ی هه‌مه‌جۆر نزیك له كووره‌كانه‌وه •• تامه‌زرۆی لاشه‌ی ته‌نیاییت بوون •

گۆره‌ی سه‌گ تا ئه‌وساته‌ش پاسه‌وانێكی به‌جه‌نگی ده‌م ده‌رگای كۆخه‌كه‌ت بوو، وه‌فای ئه‌و پارچه نانانه‌ی له مێشكدا بوو، كه به‌ئاسوده‌وه ئه‌تدایه ، بۆ ڕه‌واندنه‌وه‌ی لووره‌ی ناسازو ترسناك به تۆ •• جارجارێك سه‌رێكی ئه‌م‌سه‌رو ئه‌وسه‌ری كۆخه‌كه‌ی ئه‌داو ئه‌یدایه حه‌په ، بۆ چه‌ند چركه‌یــه‌ك لووره‌كانی تێـكه‌ڵ بــه‌و خامۆشی‌یه ئه‌كـردو ئاهێـكی پیـا ئه‌هێنایته‌وه ••

« بیبڕنەوە چیتانئەوێ •• لەعنەت لە ئێوەو لە خوێنخۆران •• ئاوا نەبوومایە چۆن زەویم لێ داگیر ئەکراو تووتنو ڕەزەکەم ئەسووتێنرا •• بیری نەبوایە ئێوەشم کەوڵئەکرد ••• »

هەستایتو دەرگای کۆخەکەت کردەوە • گۆرە خۆی دایە پێشتو بەرودوا هەنگاوی لەگەڵت نا • بەردە هەڵچنراوەکانی ناو کوورەکان شێوەی دوو کۆمەڵ پشکۆیان ئەنواند • دوا کڵپە لە پەرەمێزەکان بڕاو کوژانەوە ••

« هۆی ئەم بارەشە بوو ئەمشەو وا درەنگ کەوت •• »

« چەند هەنگاوێك پەرەمێزەکانت لە کوورەکان دوورخستەوە • پارچە تەنەکەکانت نا بەدەمی کوورەکانەوەو ڕووت لە کۆخەکە نایەوە ، گۆرەش لە حەپەحەپ نەکەوت تا چوویتە ناو جێگاکەتەوە • ئینجا گوێی هەڵخستەوە بۆ دەنگەکانو تۆش جگەرەیەکت پێچایەوە ، نات بە لێوتەوەو دەنکێ شقارتەت تیا کار کرد ••

« هەرچەندە لەئاوایيدا بێخزمو یەكباڵ بووم •• بەڵام لەم تەنیاییيەم خۆشتر بوو •• لێرە ڕۆژانە لەگەڵ دوانزە کرێکارو وەستاکەریمدا ڕووبەڕوو ئەبمەوە •• لەوێ زۆرتر بوو •• بەس نیيە ئەمانیش هاوزمانمن •• دەنا ئەبوومە پەنگو شاربەدەر ئەکرام •• ئۆخەی لەدیاری لەشە بێگۆشتەکەت حەمە گچکە کە بەیانی دێتو بەسەرم ئەکەیتەوە •• وائەزانم کوڕێکی ئازیزو ونبوومی •• دەستو دیارییەکەی ڕۆژانەشت هەر بەزیادبێ •• ئاخۆ دوای ئەوەی قوتابخانەت تەواوکردو گەیشتیتە ئامانج چی بە ئێمە بڵێی • ئێستا نیازی چاوترووکاندنت نییەو حەز لە خەو ئەکەی ، خەویش تاڕادەیەك بێهۆشییەو

دوورت‌ئەخاتەوە لەم ماڵکاولی‌یەوە ڕووناکیی چرا کزبووەکەو گەرمیی زۆپاکە گەمارۆیان داوی • وا خەریکە ئـەکەویتە پرخە پرخو ڕووەو دەریای خەوی ئەم شەوەت لەنگەر ئەگری •

گۆرەش کەمتەرخەمیی نەکردو لوورەکانی دوورخستەوە ، خۆی داوەتە بەر دەرگا شەقو شڕەکەو زووقەزووقێتی لەدەست بارەشەکەو وا خەریکە زۆپاکەش لەدوا وزەی ئەکەوێ • بێ‌ئاگاو تەنیا لەو چۆڵەدا گۆرە ئێشکی خەوت ئەگرێ •

× × ×

کارتەکەت بە چنگەکرێ دۆزی‌یەوە•• وەك ئەوانی‌تر ڕیزت‌گرت•• سەرەت هاتە سەر •• دات‌دایـە ناو ئالەتەکـەوەو کاتی چوونـە کـاری ڕاگەیاند •• هەر کە گەیشتنە ناو گۆڕەپانی کارگەوە •• تاکە تاکە لە یەك جوێ‌ئەبوونەوەو ڕووتـان لە هۆڵێـك ئەکرد •• پێ‌یەکت نابـووە نـاو هۆڵەکەوە •• دەنگی مەکینەکان هاواریان لە دەستە زبرەکانت کرد •• زۆر بەئارام چاوێکت بە تێهەڵکێش‌بوونی هەموو مەکینەکانا گێرا •• ئینجا ئاوڕێکت‌دایەوەو بە ئاسۆی بەربەیانی ئەو شوێنەدا ڕوانیت •• لێکدانەوەت چەقی‌یە دەستی ئەوکەسەی کە لای چـەپتی گرتو کێشمـی کردیتە نـاو هۆڵەکە •• بەرلەوەی دەستی بکێشێتەوە بە زمانێکی‌تر پێی‌وتی :

ــ لە فرسەتێکا یا من دێمە لات یا تۆ وەرە •• ئەوجا هەموو شتێکت بۆ ڕوون‌ئەبێتەوە ••!!

ئەو ڕۆی••هەنگاوت نا بۆ لای ئەو کرێکارەی کاری، تەواو بووەو ئەیەوێ بڕوات •• کە گەیشتیتە لای وتت :

ــ ئەرێ من باپیرم •• ؟

— بەڵێ تۆ باپیری ..!

— ئەی تۆ .. ؟

— منیش کوێخا مەحموود ..!!

— ناتناسمەوە .. ! ؟

— بەڵێ ئەومو ڕەنگێکی کەم گرتووە ..!!

— ئەی ئەوەی لەگەڵ منا هاتە ژوریێ ..؟

— ئەو خەڵکی ئێرەیە بەڵام وەك ئێمەیە ..!!

— چی ئێمەی گەیاندۆتە ئێرە ..؟

— کـار .. !

— ئەی لای خۆمان کار نەبوو . . ! ؟

— نـەما . . !

— بـۆ . . ؟

— خاك .. شەرەف .. بیروبڕوامان فرۆشت ..!!

— من نەمفرۆشتووە ..!

— فرۆشتمان ..!

— من نەمفرۆشتووە .. بەزۆر سواری ماشـێنێکیان کردمو بردمیانـە جێیەکی ترەوە .. لەوێ بەزۆر پێیان مۆر کردمو چنگێ پارەشـــیان ئاخنییە گیرفانمەوەو دەریان کردم ..

— لەسەری مەڕۆ فرۆشتمان .!؟

× × ×

تیشکی خۆرەکە لە دوا لووتکەدا خۆی نواندو بە هەوارە بەرزەدا شۆڕبۆوەو داڕژایە ناو بەستەکەی دووکانەوە . چاوەڕوانیی بێوچانـی زەویی بێجووتیار ، لەوەڕگای بێمەڕو ماڵاتی دێهات ، قاسپە قاسپی کەوی

کوێستانی ، ماندونەبوون لە یەکی کاروانی شەونخوونی ، نەبوونی جێدەستی ڕێبواری شەو لە ئێشك‌گرانی سەر گردۆلکەکان ، هەمووی لەگەڵ دوابەزمی ئەوانی ئەمشەوی چنارۆك کە لەگەڵ دوا تریفەی مانگەشەودا ڕشانەوە •• تێکەڵ بە یەك ئەبوون‌و ماڵئاوایی‌یان لە تیشکی خۆر ئەکرد •

گۆرەی ئێشك‌گرت خۆی لادا بۆ حەمە گچکەو دەرگا شەق‌و شرەکەی کردەوە ، کە گوێی بە وڕێنەو بۆڵەبۆڵەکەت کەوت •• شڵەژاو هاواری کرد ••

— هۆ مام باپیر ، هۆ مام باپیر ••

— نەمفرۆشتووە : نەمفرۆشتووە ••

پڕی‌کردە چراکەو گڕەکەی زیادکرد ••

— هۆ مام باپیر ••

— ئەڵێم نەمفرۆشتووە ••

لێفە شرەکەی کەمێك خزاندە خوارێ‌و سەرتی بەرز کردەوە ، دەستی ڕاوەشاندی‌و بەئاگای هێنای • چەند جارێك چاوت هەڵهێناو داتخستەوە • چاوێکت بە کۆخەکەدا گێڕاو تێر سەرنجی حەمەت دا •

— مام باپیر خۆ ناساغ نیت •••؟

— بەساقەی سەرت بم حەمە گیان ••

— ئەوە بۆ وات‌ئەکرد •• ؟

— خەوێکی سەیرم بینی ••!

— هیچ نی‌یە مام باپیر ، خەو درۆیە ••

زیاتر لەسەری نەڕۆیشت‌و هەستا ••

ـــ مام باپیر زۆپاکە گەرم ئەکەم ، ئەمڕۆ ساردە ، کە کرێکارەکان هاتن با لەڕێوە تۆزێ خۆیان گەرم کەنەوە ..!؟

زۆپاکەی پێ کردو ڕووی لێ نایەوە ..

ـــ مام باپیر ئەمڕۆ زۆر ساردە ، ئیتر مەیە دەرێ‌و کارمان لەگەڵ مەکە ، چونکە کاری تۆ کورە جۆش‌دانە ..

ـــ حەمە گیان خۆم ناگرم‌و ئەوەندە بێ‌غیرەت نیم !!

ـــ ڕاست‌ئەکەی بەڵام هەر کارەو کاتی خۆی ، ئەگەر کارمان لە دوازدە تەواو نەبوایە نە کارم بۆ ئەکراو نە ئەشم‌توانی دەوامی قوتابخانە بکەم ..!؟

ـــ پیشەی هەژار هەر وایە ..!!

هەر کە کرێکارێك ئەهات خێرا خۆی ئەدایە بەر زۆپاکە تا گەرم‌ئەبوەوە . ئینجا ئەمیش باسەکەی ئەپچڕاندو گلۆڵەی باسێکی‌تری ئەکردەوە ..

ـــ دەخیلتان بم ئەوا ئێمە لەتاو هەژاری‌و نەبوونی چارمان نی‌یە . . بەڵام پێم‌ناڵێن بەم‌سەرمایە ئەم گەچە چۆن سەرف‌ئەکرێ ..؟

ـــ لە ئێمەش هەژارتر هەیە بۆ ئەو کارە ..

لایەکیان بۆ وەستا کەریمیش کردەوەو خۆی دایە بەر گەرمی زۆپاکەو ڕووی‌لێ‌نایت ..

ـــ مام باپیر ئەمڕۆ دیاریم بۆ هێناوی ..

ـــ وەستا کەریم ئێوە خۆش بن خۆتان دیارین ..!

ـــ ئەو چەند پاکەتە جگەرەیەم بۆ هێناوی ..

حەمە خۆی نەگرت‌و هەڵی‌دایە ..

— مام باپیرم خۆش ئەوێ ، ئەمڕۆ خواردنی باشم بۆ هێناوە ..

بەدەم ئەم قسانەوە وەستا کەریم ڕووی تێ کردن ..

— گەرم بوونەوە ، با ئینجا بکەوینە کار .

× × ×

دەستیان کرد بە کار . بەردە سووتاوەکانی ناو کوورەکانیان هانیە دەرو بە پیك و دەمەپاچ وردیان کرد . ئینجا کەوتنە گواستنەوەی بۆ نـاو دەمی یەکەمی ئاشەکە ، لەژێر دەمی دووەمی ئاشەکەوە تراکتۆر ئەوەستاو گەچ بەرێ ئەکرا .

ئاشەکە لە کار نەئەکەوت تا هەموو بەردەکە تەواو ئەبوو . دووبارە ئەکەوتنەوە بەردکێشانو کوورەکانیان بۆ شەوێکیتری تۆ ئامادەئەکردو سەعات دوانزە جێیان ئەهێشتی .

کاری ئەوڕۆش تەواو بوو . هەریەکە پارەی مانگە کاری وەرگرتو ڕۆی . تۆو وەستا کەریم مانەوە ..

— مام باپیر ئەوەش مووچەکەی تۆ ، ئەگەر کەمیشە وەبان چاو زیادت ئەدەمێ ، چونکە بێ لە ئیشەکەی خۆت ئیشیتریش ئەکەی ..!؟

— هەتا ئێستا پێویستیم بە هیچ نەبووە ، زیاد لە پێویست کرێکارەکان شتیان بۆ هێناوم ..!!

— نابێ . هەقی خۆتە ، ئەبێ وەری گری .

— پارەم ناوێ ، با لای خۆت بێ ..!

— نابێ ئەبێ وەری گری .

— ئەڵێم نامەوێ با لای خۆت بێ ، پارە دڵی من ناهێنێتەوەجێ ، با لای خۆت بێ ، ئەگەر منیش سەرم نا بە دەردەکەی خاڵخاسی ئازیزەوە ، ئێوە کفن‌و دفنم کەن ..!؟

هیچ شتێك نـەبوو لەونـاوەدا ڕێ بە فرمێسـکی چـاوە سـوور هەڵـگەڕاوەکانی وەسـتا کەریـم بـگرێ . گـۆڕەش بەدیارتانـەوە هەڵتروشکابوو . زیاتـر لە سەری نەڕۆیشـت‌و ڕێـی شـاری کۆیەی گرتەوەبەر . ئەو ڕۆژە تا درەنگ هەر کەسێکی ئەبینی بەسەرهاتی تـۆی بۆ ئەگێڕایەوە .

**تشرینی دووەمی ١٩٨٠**

ئەوی باوەڕی بە خۆی هەبێ ، پێویستی بەوە نییە ئێمە بە شان‌و باڵیا هەڵبدەین . ئەوەیش بێ‌یەوێ بە شان‌و باڵیا هەڵبدەین ، دیارە گومانی لە دەسـەڵات‌و توانـای خـۆی هەیـە .

**گۆستاو لۆبۆن**

# سروودی ئاوابوون

**جەلال بەرزنجی**

تارمایی ( بـا )
لەناو سپیاتیی مانگەشەو جێما
جووتە سەگێکی جێماوی بنارێکی ساردیش
بە هەوەسی دەروون ،
یەکتریان تیدا دەگەوزاندو دەلستەوە
تـا وشکبنەوەو بچنەوە ناو خاك
تـۆ ماوی ..
ئەو سپیاتییەو ،
سپیاتیی ئەو پووشەڵانە هەمیشەیی.
یا بەفری تەنیای ئەو ترۆپکە
کامیان دەکەیتە کفنی ئەمشەوەت ؟
دەرگا لەسەر خۆت دەکەیتەوە
کێ ماوە چاوەڕوانیت بکا ؟
نەشچیتە بنارە ساردەکە

گوێت لە سروودی ئاوابوون دەبێ
ئێوارەکە وای لێ هاتووە ؛
گورگەکان بە کۆمەڵ
لە ترۆپکی تەنیایی خۆیان دێنە خوارەوەو ،
سروودی ئاوابوون دەڵێن •
سپیایی مانگەشەو لە سروشت جیادەبێتەوە
بەفریش لە شتە پاکنەبووەوەکان !
پووشەڵانیش نەمری دەدا بە خۆی
کامیان دەکەیتە کفنی ئەمشەوەتو ؟
بەسەر (با) جێماوەکەدا پەرتدەبی
گیایەکی سەرەتاییش لە شوێنەوارت دەڕوێ
سروشت تووشی سەرسامبوون دەکاو
بەئەسپایی دەگەڕێتەوە شوێنی خۆیو
خۆی کڕ دەکا •

# چەند سەرنجێکی پێویست دەربارەی
# « سەرەتایەکی پێویست بۆ ئەدەبی منداڵان »

**سەلام مەنمی**

نووسەر کە خامەکەی بەدەستەوە گرت ، ئەبێ دڵسۆزو ڕاستگۆ بێ ، مەبەستی پێشکەوتنی ئـەدەبی گەلـەکەی بـێ ، لێکدانەوەکانی زانستی‌یانە بن‌و خوێندەوار بە بەڵگە ڕازی بکەن •• ئەبێ لەخۆیەوە چێو لە تاریکی نەکوتێ •• ئەو بەرهەمەی لەسەری ئەنووسێ جوان تەتەڵەو گێژی بکات‌و سوورەکەی نیشانی خوێندەواران بدات ، ئەوجا شایەتیی بۆ ئەدەن‌و ئەڵێن بەڕاستی سوارچاکی مەیدانە • خۆ ئەگەر هات‌و خۆی بە سوارچاکی مەیدان زانی‌و بڕیاری زاتیی دەرکرد، ئەوا زوو بڕیارەکەی ڕەت‌ئەکەنەوەو خۆیشی زوو ئەگلێ •

کاك جەزا عەلی ئەمین نووسینێکی لە نووسەری کوردی ژمارە (٦)دا بڵاو کردەوە هەر لە سەرەتاوە زوربەی ئـەدیبانی کـوردی تیا تاوانبار کردبوو • کاك جەزا لەو وتارەیدا ئەڵێ : « زۆرن تا ئەم کات‌و ساتـــە ئەدەب‌و هونەری منداڵان بە کارێـکی سانا دەزانـن •• ئەمەیش تەنها ئەوانە ناگرێتەوە کە لە پەنا پاسارانا تانووتی خۆیان دەهاون ، بەڵکـە

ئەوانەیش دەگرێتەوە کە سەرگەرمی نووسینن • ئەم نیشتمانە گەورەیە هەموو کەسێك سەری لێ دەرناکات » •

لێرەدا پرسیارێك سەرهەڵئەدات : ئەوانە کێن تانووت لە ئەدەبی منداڵان ئەدەن ؟ هەق وابوو لەم تەمو مژا نەیهێشتایەتەوەو بە بەڵگەوە پێی بسەلماندینایە •• من بڕوا ناکەم نووسەرێك توزقاڵێ هوشیارو دڵسۆز بێ بێت تانووت لە ئەدەبی منداڵان بدات • ئەگەر بەدەگمەنیش ڕێك بکەوێ ، ئەوە بێ گومان قەڵەمەکەی کوڵەو لە ئاوێکی لێڵا مەلەئەکات• بەڵام ئاوانبارکردنی زوربەی ئەدیبانیش کارێکی ناڕەوایە • بە قسەی کاك جەزاشدا وادیارە هەر خۆی سەر لەو نیشتمانە گەورەیە دەرئەکاتو باڵەی مەیدانەو داسێکی دەمەزەردکراوی بەدەستەوەیەو بە ڕاستو بە چەپدا سواڵە فڕێئەداو بەردەوامە لە بەکرەیدا •• ئەوەکانیتریش سەرو داسوولکەیان پێیەو قولچەبڕ ئەکەنو جارجاریش دەستی خۆیان ئەبڕن • کاکی باڵەیش پشت هەڵئەبڕێو ئەکەوێتە ئامۆژگاری کردنیانو بە کوڵەواریان دائەنێ •• من حەزم ئەکرد کاك جەزا ئەو باڵەیە بوایە ، بەڵام بەداخەوە هاتوە نووسینەکەی کردوە بە داردەست سەرو ملی هەموو ئەوانەی پێ ئەکوتێتەوە کە زاتیان کردوە لەسەریان نووسیوەو ڕەخنەیان لێ گرتوە ، وەك بڵێی بە کەوشەوە چووبنە ناو حەرەمی کەعبە !

من نایەم لەم کورتە وەڵامەدا لەسەر ئەو برادەرانە بێمە دەنگ ، بۆیە تەنها سەبارەت بە ڕەخنەکانی لە خۆم ئەم چەند دێڕە ئەنووسم :

١ ـ کاك جەزا کە دێتە سەر باسی چیرۆکی «سوێسکەو کۆترە»ی من ، ئەڵێ : «قەلە باچکەیەك کۆترێ ئەنێتە ژێرو قاچی ئەشکێنێ •• کەچی سوێسکەکە بە لاقی شکاوەوە دەڕواو قەلەباچکەکە نایگرێتەوە »

من ئەمەوی پرسیارێك لەکاك جەزا بکەمو بڵێم : سوێسکە بە لاق ئەڕفێ یان بە باڵ ؟ یان کامیان سووکو سۆڵترن ؟ گومان لەوەدا نییە سوێسکە سووکترە ، دیارە خێراتریشە • جا ئەگەر بەو پێودانــە بێ ئەبێ داڵەکەرخۆرێك واشەیەکی لاقشکاو بگرێتەوە ، لەگەڵ ئەوەیشا کە ئەگەر هەردوو قاچیشی بشــکێ نایگرێتــەوە • • جــا من نـازانم چ ناڕاستگۆیی‌یەك لەمەدا ئەبینرێ •• وابزانم ئەمە نابێتە هــۆی ئەوەی لەو نیشتمانە گەورەی کاك جەزا مەبەستێتی دەرکرێین !

٢ ـ لە باسی فۆلکلۆردا لەبابەت چیرۆکی ( مارەکەی شێخ هۆمەر)ەوە ئەڵێ : « کاك سەلام مەنمی چیرۆکی مارەکەی شێخ هۆمەری لە هاوکاریی ژمارە ٤٦٤دا بە ناوی خۆیەوە پەخش‌کرد • جێی سەرنجە ئــەم چیرۆکە بــە هەمان نـاوەوە لە گەلاوێــژدا ٣٠ساڵ لەمەوبەر بڵاوکراوەتەوە •• دەبێ ئاگامان لەو چیرۆکە فۆلکلۆری‌یانە بــێ هیچ نەبێ بەئەمەکانە بڵێین فۆلکلۆرین » •

کاکی برا ! من بەش‌بەحاڵی خۆم بەئەمەکانە لە هاوکاریی ژمارە ٤٦٤دا لە سەرەوە نووسیومە « چیرۆکێــکی فۆلکلۆری بۆ منداڵان » • تەنانەت نەیشم‌وتوە بە دەسکاری‌یەوە • ئەوەیش هاوکاری •• حەزئەکەم ئەمجارە تۆیش‌و خوێنەوارانی‌تریش بیخوێننەوە • ئەوەی ڕاستیش بێ من نەمزانیوە لە گۆڤاری گەلاوێژدا بڵاوبوەتەوە • ئەگەر زانیبێتیشم ، ئایا بە هەمان داڕشتن بڵاوبوەتەوە ؟ ئەگەر بە هەمان داڕشتنیش بێت ، چ‌زیانێك ئەبەخشێ ؟ بــا ئەوکەسانــەی وەك مــن گەلاوێژیــان نەخوێنــدوەتەوە بیخوێننەوە •• ئەمجارەیش ئەڵێم هیچ داهێنانێکی منی تیا نی‌یە ، بەڵام کاك جەزا خۆی ، وەك مامۆستا کەمال غەمبار لە ( بیری نوێ )دا ڕوونی

کردبوەوە ، لە (شەمامە)دا چەند چیرۆکێکی فۆلکلۆریی بە ناوی خۆیەوە بڵاوکردبوەوە بێ ئەوەی بڵێ فۆلکلۆرین •

٣ - لەبارەی چیرۆکی (تەتەڵەمیران)ەوە ئەڵێ : « ڕەنگ نابێتە هۆی ناکۆکی» • ئەوەی ڕاستی بێ کاك جەزا لە چیرۆکەکە نەگەیشتوە• ناکۆکی‌یەکە لە شارەکەیانەوە دەستپێ‌ئەکات •• ڕەنگیش ئەبێتە هۆی ناکۆکی • ئەگەر نابێتە هۆی ناکۆکی ، بۆچی سپی‌یەکان لە ئەمەریکا ڕقیان لە ڕەشەکانە ؟ تەنانەت ئەوانەیش لە ئێرلەندەو ئیتالیاو ئیسپانیاوە هاتوونەتە ئەمەریکا •• گوایە ئەمانە بۆچی ئەبێ ڕقیان لێیـان بـێ ؟ ئەگـەر مەسـەلەکە کاروبـاری نیشتمانـی‌و شارستانی‌یەتە ، خۆ ئەمانە لە چەند نیشتمانێکەوە هاتوون‌و ئەمەریکا نیشتمانی ئەسڵی‌یان نی‌یە ؟

× × ×

لە کۆتایی‌دا ئەمەوێ پرسیارێ لە کاك جەزا بکەم‌و بڵێم : ئاخۆ ئەو هەموو چیرۆکنووسەی ئەو لە وتارەکەیدا ناوی هێناون‌و لە نیشتمانی گەورەی ئەدەبی منداڵان دەری کردوون ، سەرو چیرۆکیان نەبوو بە دڵی ئەو بێ‌یان هەر لە سەرەتاوە بڕیاری‌داوە سەرو پۆتەڵاکیان بکوتێتەوە ؟

# جووتێ پێڵاو *

شیعری : شێخ ئەنوەر

خامە ! وەرە لەگەڵ تاسەم
لەگەڵ شەپۆلی هەناسەم
زویر مەبە لە پەنجەما ،
لەگێژاوی ئەم باسەما ..
لەسەر دێڕی پەڕەی شێواو
چەندین ڕووداوو .. چەند نەشیاو
هەڵئەهێنجم لە گیانی خۆم
لە ژیانی ئەمڕوێ ئەتۆم ..
لە بۆ گێتی .. لە بۆ مرۆڤ
لە ڕووداوی سەد ئاخ‌و ئۆف
چەند ئابڕوومان تکان .. بۆچی ؟
چەند گوڵمان هەڵوەران .. بۆچی ؟
بۆ نان .. بۆ ڕۆژێ لە ژیان ..
بەنایان ئەهێنا بۆمان ..

× × ×

خامە ! لەگەڵ جووتێ پێڵاو
جووتێ پێڵاوی بەجێماو ..
منداڵێکی سەرلێشێواو
هات بە پرتاو .
لە شارەکەی پڕ مەترسی
ڕای ئەکرد بە سکی برسی ..
ئەڕۆی .. ئەیوت و ، ئەیپرسی :
جووتێ پێڵاوی بەجێماو ..
چاوی سەرنج لە جێی جێماو
ئەخولانەوە وەك بینی ئاو
پڕ بوون لە خۆزگەی تێكشكاو
ئەڕۆی ئەیوت : جووتێ پێڵاو

**بڕیـار**

دایە ! دایە ! نەیدۆزمەوە ..
ئەمشەو لای تۆ ئەمێنمەوە
لە گۆڕستان . .
شەوی زستان
سەر ئەنێمە سەر گۆڕەکەت
بەسەرهاتم ئەگێڕمەوە
هەرچەند شەوەو ،
منداڵ هەمووی گێژی خەوە ..
دایە ! خەوی تۆیش ئەزڕێنم

لەگەڵ خۆما ئەتگریێنم ••
ئەتگریێنم تا مردوەکان
گشت هەڵئەستن
کۆڕی دواڕۆژیان ئەبەستن
ئەوسا سنگت بکەرەوە ••
فرمێسکێکم وردکەرەوە ••
ئەو فرمێسکەی دوێنی دەرگای شەرمی شکان
لەچاو ڕژا ئازارو ژان ••
بۆ سەر پێڵاو ••
ئەو فرمێسکەی ، هەر دڵۆپەی
کە بە خەمێ دائەگیرسێ
لە گیتی‌دا چونکە منم ،
هیچ دادگایە لێی ناپرسێ ••
دایە !• دایە !••
لەم شوێنەدا چەند هەڵوێستێ
بۆ مەبەستێ ••
ڕێ ئەبەستێ •••

---

★ بە یادی ئەو هەتیوە بێ‌دایکەی بەردەستی باوەژن ، کە لە کرێ‌دەستی ساڵێـکی جووتێ پێـڵاوی کڕیبوو و لـێی ون‌بوو‌بوو و لە ترسی باوەژنەکەی نەیئەوێرا بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە •

# عەبدوڵلا عەزیز

مومتاز حەیدەری

مێژووی رەوتی رۆشنبیریو ئەدەبو هونەری هەر نەتەوەیێك زادەی بیری دەیان رۆڵەی رۆشنبیرو دڵسۆزی نەتەوەو خاكو گیانی مرۆڤپەروەری‌یە • بگرە پێشکەوتنی هەر نەتەوەیێك ، هەر کۆمەڵێك بۆ دروست‌بوونی چۆنیەتیی سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە ، واتە سەرچاوەکەی چەند بەپیزو ڕەسەنو دڵسۆزانە بێ ڕەوتەکەشی ئەوەندە دەوڵەمەندو کاریگەرو پێشکەوتوو دەبێ •

باری ئەمڕۆی رۆشنبیری‌و ئەدەبو هونەری هاوچەرخ ، بەتایبەتی هیی نەتەوەو میللەتە پێشکەوتوەکان راستیی ئەم بۆچوونەمان بۆ دەسەلمێنێ، کە زادەی هەوڵو کۆششی سەدان ساڵە کە مرۆڤایەتی پەیڕەویی دەکات •

کوردیش لە رەوتی گەلاڵەبوونیەوە وەك نەتەوەیێکی سەربەخۆ لەڕووی مەرجەکانی بوونی نەتەوەیی بەپێی توانا ـ بگرە لەتوانا بەدەریش ـ و بەگوێرەی یاسای تایبەتی‌و گشتیی ژیانو کۆمەڵ هاوبەشیی ئەم ڕەوتەی مرۆڤایەتیی کردوەو دەکات ، لەکاتێکدا کە باری زاتیی‌و مەوزوعیی کورد بەپێچەوانەی خواستی بوە••• جا بۆیە پلەی رۆشنبیری‌و باری گۆڕانی گشتیی کۆمەڵی کوردەواری لەئاستی گەلانی دراوسێی نەبوەو نی‌یە !! لەگەڵ ئەمەشدا بەگوێرەی پێوانەیێکی وردو زانستی‌یانەو

لەچاو نەتەوەکانی‌دیکەدا ـ ئەگەر تەماشای باری رۆشنبیری‌و ئەدەب‌و هونەرو گۆرانی گشتیی کورد بکەین کە لە بارێکی زۆر ئاڵۆزو دژواری کۆمەڵایەتی‌و سیاسی‌و نەتەوەیی ژیاوە ـ دەبینین هێشتا تارادەیێك ، پێشکەوتووە ، لەکاتێکدا کە مەرجەکانی ئەم «پێشکەوتنە» بەگشتی لە زەمینەو چوارچیوەیێکی سەربەست‌و بەپێی خواستی کورد نەبوە .

بەکورتی : سەرچاوەو سووتەمەنیی رۆژگاری ئەمڕۆی ژیانی رۆشنبیری‌و ئەدەبیاتی کورد ، ژمارەیێك مرۆڤی هوشیارو دڵسۆزی خاك‌و نەتەوەن کە بە شەونخونی‌و جوامێری ، دۆڵی ژان‌و ئەشکەنجەی ژیانیان بریوەو بەردی بناغەی مێژووی پڕشکۆی رەوتی رۆشنبیری‌و ئەدەبیاتی کوردیان دروست‌کردوە .

لەم مەیدانە پیرۆزەدا ناوی نەمری دەیان سوارچاکی کەم‌وێنەی وەك ئەحمەدی خانی‌و نالی‌و مەولەوی‌و میقداد مەدحەت‌و عەبدوڕڕەحمان بەگی بەدرخان‌و حاجی قادری کۆیی‌و . . . هەردەم وەك کێوە سەرکەشەکانی کوردستان پەنجە بۆ خۆر درێژدەکەن .

لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا ـ سەدەی ژیانەوەی بیری نەتەوەیی‌و ئازادیی گەلان ـ بەتایبەتی لە ساڵانی شەڕی یەکەمی جیهان‌و بڕانەوەی ، ناوی ژمارەیێکی دیکەش بەشانازی‌یەوە دێتە ناوەوە ، وەك : محەمەد میهری ، شوکری فەزلی ، مستەفا پاشا یاملکی ، ئەمین فەیزی ، رەفیق حیلمی ، محەمەد ئەمین زەکی بەگ ، ساحێب‌قڕان ، حوزنی موکریانی، مستەفا شەوقی، پیرەمێرد، گۆران ، عەبدولواحید نوری ، شێخ نووری شێخ سالح ، دڵدار ... ئەمانەو چەندانی دیکەش ناسراوو لەبیرکراو .. کە رۆڵێکی یەکجار گەورەیان لە دامەزراندن‌و چەسپاندنی رەوتی بەرەوپێش‌بردن‌و پێشکەوتنی ژیانی ئەدەبی‌و رۆشنبیریی کوردی‌و

هوشیارکردنەوەی سەدان ، بگرە هەزاران لاوی خوێنگەرم ، گێڕاوە •
بەتایبەتی ژمارەیێك مامۆستای قوتابخانەکان سۆمی گەش بوون لە شەوەزەنگی ژیانی کوردەواری ، لەمانە : ئەحمەد فەخری ، سەعدی جەلال ، مستەفا بەهجەت ، فوئاد رەشید ، عەبدوڵلا عەزیزو گەلێکیدیکە•

لێرەدا دەمەوێ هەوڵو کۆششی یەکێك لەو مرۆڤە لەبیرکراوانە ، کە عەبدوڵلا عەزیزی رۆشنبیری نەتەوەپەروەرە ، بە خوێندەواران بناسێنم بەتایبەتی لاوەکانمان کە پێویستە زیاتر ئاگاداری ڕابردووی دێرینمان بن چونکە ئەگەر شانازی بەم قۆناغەی ئەمڕۆی ژیانی رۆشنبیریو ئەدەبیو تەنانەت نەتەوەییو سیاسیش بکەین •• دەبێ بەرێزەوە ئاوڕێکی هوشیارانە لە رابردوو بدەینەوە ، لەوکاتەدا عەبدوڵلا عەزیز بەپێی کردەوەو هەڵویستەکانی بە ڕابەرێکی دڵسۆزو هوشیار لە کاروانی پیاوە چاكو نەمرەکانی کورددا دەژمێردرێ •

دوای ئەم پێشگۆتنە ئێستا سەربردەی ژیانو کردەوە چاکەکانی ئەم مرۆڤە بەکورتی باسدەکەین •

● **سەربردەی ژیانی :**

ـ عەبدوڵلا کوڕی عەزیزی حاجی محەمەدی رەحیمە (١) لە ساڵی ١٩٠٤ لە هەولێر هاتۆتە دونیاوەو لە بنەماڵەی ئەردەلانی کوردستانی ئێران بوە ••

ـ باوکی عەبدوڵلا ـ واتە عەزیزی حاجی محەمەد ـ ئەفسەرێکی سوپای عوسمانلی بوە • پاش ڕووخانی دەوڵەتی عوسمانلی لە ئەستەمبووڵ ماوەتەوەو نەگەڕاوەتەوە هەولێر •

(١) ئەم زانیاری‌یە تایبەتی‌یەم لە کاك نەژادی عەبدوڵلا عەزیز وەرگرتوە•

— خوێنـدنی سەرەتایی لـە هـەولـێرو ناوەنـدیشی لە کەرکـووك تەواوکردە • پاشان لە خانەی مامۆستایان لە بەغدا وەرگیراوەو سالی ١٩٢٥ بۆتە مامۆستاو لە شاری ( العمارة ) دامەزراوە •

● **چالاکیی نەتەوەیی‌و سیاسی‌و رۆشنبیری :**

— لەگەڵ رەفیق حیلمیی نەمردا لە کۆمەڵی ( خویبوون ) هاوکاربووەو پاشان گوێزراوەتەوە بـۆ سلێمانی‌و لەوێ لە قوتابخانـەی زانستیی کوردان دەرسی گوتۆتەوە • هەر لەوکاتەشدا چۆتە ریزی (حیزبی هیوا)و لەسەر خواستی ئەو حیزبە چۆتە تورکیاو سووریا بۆئەوەی پێوەندی بە کوردەکانی ئەوێ بکات ، بەتایبەتی لەگەڵ جەلادەت عالی بەدرخان ••• ئەوەی شایانی باسە ماوەیەکی زۆر بەهۆی نامە ناردنەوە لەگەڵ جەلادەت بەیەکدا باسی چۆنیەتیی نووسینی کوردی‌یان بەتیپی لاتینی ـ کردوە • پاشدان گویزراوەتەوە بۆ کۆیەو لەوێش دەورێکی گەورەی دیوە لە هوشیارکردنەوەی قوتابی‌یان‌و گیانی نەتەوەپەروەریی پێبەخشیون • مامۆستا میرزا عبدالکریم دەڵێ : « راستی‌یەکەی مامۆستا زۆر هۆشمەندو زیر بوو ، هەمیشە باسی خاکی کوردو کوردستانی بۆ قوتابی‌یان دەکرد •• مامۆستایێکی زۆر مەزن بوو ، نەك هـەر مامۆستا بگرە بـاوكو برادەری قوتابی‌یان بوو (٢) » •

---

(٢) مامۆستا میرزا عبدالکریم لە رۆژی ٢٩ـ٣ـ١٩٧٨ لە نووسینگەی رۆژنامەی عێراق ئەم قسانەی بۆ کردم ، هەروەها گوتی ئەوکاتە من پۆلی پێنجەمی سەرەتایی بووم ••• ئێستا مامۆستا میرزا کۆچی دوایی کردوە•لە چلەکاندا یەکێك بوە لە نیشتمانپەروەرەکانی کورد•

● **هەستی نەتەوەپەروەی :**

عەبدوڵلا عەزیز بەگشتی مامۆستایێکی لێهاتوو و ڕۆشنبیرێـــکی دووربین بوو • بە قســەی هاوڕێو قوتـابی‌یەکانیو بەگوێـرەی ئـەو بەرهەمانەی لەدوای بەجێ‌ماون ، لە مەیدانی پسپۆڕیی خۆی‌دا دەورێکی باشی دیوە لە پێ‌گەیاندنی گەلێ قوتابیو وەك مەشخەڵ بۆیان داگیرساوە، لە سەرێکی دیکەوە ، کە لایەنێکی زۆر گرنگەو نیشانەی گیانی نەتەوە پەروەری‌یەتی ، هەر لە سەرەتاوە هەستی بە گرنگیی خوێندن بە زمانی زگماکی کردوە • بۆیە دەبینین لە ساڵی ١٩٢٨دا کتێبی (دەرسی ئەشیا)ی بە زمانی کوردی بلاوکردۆتەوە •

ساڵی ١٩٤٠ واتە چل ساڵ لەمەوبەر کـتێبێکی دیکەی لە زمانی عارەبی‌یەوە کردوە بە کوردی • ئەم کتێبەیان باسی دەردێکی کۆمەڵ دەکات لە قۆناغێـکی ناسـکی لاواندا ، ئـەویش مەسەلـەی دەستبەڕە ، لەکاتێکدا ئەم چەشنە باسە لێدوانی بە شوورەیی دەزاندا • جا ئـەگەر یەکێك هەستێکی نەتەوەیی‌و مرۆڤ‌پەروەریی نەبێ‌و زمانی زگماکی بەلاوە گرنگ نەبێ بۆ هوشیارکردنەوەی لاوانی نیشتمان بەتایبەتی لە ڕۆژگاری پاشکەوتوویی کورددا ، کاری‌وا ڕاناپـەڕێنێ ؟! تـائێستاش ئەم چەشنە بابەتانە لە گۆڤارو ڕۆژنامە کوردی‌یەکانا کەم دەکەونە بەرچاو • ئـەم مرۆڤە وا دیارە زۆربەی بیرو هەستی هەر لای نەتەوەو کۆمەڵەکەی بوە ، هـەردەم بـیری لـەوە کردۆتەوە چـۆن لاوانـی کـورد پێ‌بـگەیەنێ کە کۆڵەکەی کۆمەڵی دوارۆژن شەوەزەنگ دەبەزێنن‌و چراو مەشخەڵ لە هەموو سووچێکی کوردستان دادەگیرسێنن ••••

عەبدوڵلا عەزیز زۆربەی برادەرەکانی لە مرۆڤە ڕۆشنبیرەکانـــی ئەوسا بوون وەکو : ڕەفیق حیلمی ، نوری شێخ ساڵح ، فائیق بێکەس ،

شاکیر فەتتاح ، عەبدولخالیق ئەسیری ، فوئاد رەشید ، کەریم زانستی ، بێخود ... هەردەم باسی ژیانی رۆشنبیری‌و باری نەتەوەی کوردی لەگەڵ ئەم زاتانە کردوە . چەند وتارو بابەتێکی لە گۆڤارو رۆژنامە کوردی‌یەکانی ئەوسادا بڵاوکردۆتەوە ، چ بە ناوی ئاشکرای خۆی بێ‌و چ بەم‌نازناوانە : « نەژاد ، عەولا ، عەولای هەولێری ، ن. ع. ع. »

کاك نەژادی کوڕی دەڵێ : « ئەم‌کتێبە دەستنووسانەیشی هەیە :

١ ـ جگەرەکێشان

٢ ـ کارەساتی بارزان

٣ ـ دیوانێکی شیعر »

هەرچەندە من ئەم دەستنووسانەم نەدیوە بەڵام نیشانەی لێهاتوویی عەبدوڵڵا عەزیزن .

**● عەبدوڵڵا عەزیزو کۆنگرەی مامۆستایان لە شەقڵاوە :**

عەبدوڵڵا عەزیز لەئەنجامی خەبات‌و کۆششی درێژساڵەی لە کۆڕی وشەی کوردی‌و لە بـواری فێرکردن‌دا ، ئەندامێـکی چالاکی دوەمین کۆنگرەی مامۆستایانی کورد بوە لە شەقڵاوە بەڵکو ئەم کۆنگرەیە ئاواتێکی عەبدوڵڵا عەزیز بوە کە هەر لە ساڵی (١٩٢٨)ەوە بە وەرگێڕانی ـ دەرسی ئەشیا ـ بناغەی داناوە . مامۆستا کەریم شارەزا لەبارەی دەوری عەبدوڵڵا عەزیز لە کۆنگرەکەدا دەڵێ :

« مامۆستا عەبدوڵـلا هاوبەشیی لە دوەمین کۆنـگرەی مامۆستایانی کورددا کرد کە لەنێوان ١٥ ـ ١٧ی ئابی ١٩٦٠دا لـە شەقڵاوە گیراو بەشداری چـەند لێژنەیەك بوو .

لەوکاتەدا پیرێکی بە ساڵاچوو بوو ، هەموو سەری سپی بوو ، گۆپاڵێکی حەیزەرانی بەدەستەوە دەگرت بۆئەوەی لەکاتی ڕۆیشتندا خۆی پێ ڕابگرێ ، چونکە بێجگە لە پیری‌و بێهێزی ئێش‌و ئازاری ڕۆماتیزمیش تەنگی پێ هەڵچنیبوو (٣) » .

● **ڕێزی لەنێو خەڵکدا :**

ئەوانەی کە من سۆراغی عەبدوڵڵا عەزیزم لێ کردوون‌و ئەوانەی کە وەختی خۆی ناسیویانەو هەڵس‌و کەوتیان لەگەڵ بوە هەموو لەوبڕوایەدان کە عەبدوڵڵا عەزیز مرۆڤێکی چاکەپەروەرو مامۆستایێکی ڕاستەقینە بوە ، بگرە ، هەندێ دەوری گەورەشی دیوە کە تائێستا بزرە ، یەکێك لەوانەی باسی عەبدوڵڵا عەزیزیان بۆ کردم ــ لەیادم نی‌یە کێ بوو ــ گوتی : « لەشۆڕشی ئەیلوولیشدا هاوبەشیی کردوە ، و هەربۆیەش لە سلێمانی‌یەوە گوێزراوەتەوە شوێنێکی‌دی » .

شتێکی‌تریش هەیە بەلامەوە گرنگە بیخەمە بەرچاوی خوێندەواران. ئەویش ئەوەیە کە کتێبی [ دلیل تاریخ مشاهیر الالویة العراقیة ] بەشانازی‌یەوە ناوی عەبدوڵڵا عەزیز دێنێ‌و دەڵێ : « یەکێکە لە پیاوە پێشوەکانی پەروەردەو فێرکردن‌و لە پیاوە لێهاتووەکانی ئەمڕۆی بەڕێوەبردن ، چەندان فرمانی پەروەردەیی‌و بەڕێوەبردنی دیوە ، لە هەموو کارێکدا نموونەی فەرمانبەری دڵسۆزو چالاك بوە ، هەردەم بە

---

(٣) مامۆستا شارەزا ڕۆژی ١٧ــ٦ــ١٩٧٨ لە نووسینگەی عێراق لە وەلامی پرسیارێکدا ئەم وەلامەی دامەوە .

گیانێکی لەخۆبووردنو دڵسۆزانە کارو فرمانی جێبەجێ کردوە (٤) •

ناوهاتنی عەبدوڵڵا عەزیز لەم کتێبەو بەمشێوەیە بەڵگەیەکیترە بـۆ دەستنیشانکردنی دەوری لێهاتووی ئەم مرۆڤە کە لەگەڵ دەیان مرۆڤی کوردپەروەری دیـکە ـ لەبـەر دەستکـورتیی کـورد ـ لە چاڵی ژاندا بزربوون •

● **ماڵئاوایی :**

رۆژی [٥]ی حوزەیرانی **١٩٦٢** لە شاری کەرکووك کۆچی دوایی کردوە ، تـەرمەکەیشی لە گۆڕستانـی بنـەماڵەکەیان لە شـاری هەولـێر نێژراوەو لەسەر راسپاردەی خۆی ئەم دوو دێڕە شیعرە لەسەر گلکۆکەی نووسراوە :

**مەغروری بە خۆشیو ترشی دنیا خەیاڵی خاوە**
**چەرخی گەردوون هەر لەسەر شوێنێك نەسووڕاوە**

---

(٤) بڕوانە عبدالمجيد فهمي حسن، دليل تاريخ مشاهير الالوية العراقية، بغداد ، ١٩٤٧ ل ١٤٨ •

# له دەفتەری جەنگاوەرێکدا

**حەمەکەریم هەورامی**

ئەورۆژە خۆم لە دەست ویژدانە داپلۆسراوەکەم دەربازکــرد ، لەتەك ئارەزوە هارە تاساوەکانمدا بەدزی‌یەوە ڕۆیشتین ؛ هەر ڕۆیشتین، بەونیازەی بای باڵێك بدەین •• چەند خەیاڵ ڕێگەی داین هەر ڕۆیشتین، دیاربوو لە جیهانەکەی ناو کەوڵی خــۆم تێپەڕمان نەکــردبوو •• نازانم چۆن بوو ڕێمــان کەوتە لای چــەند کــەلاوەکۆنێکی وێرانە ، کــە وەك کۆنەهـــەواران وابوون ، تەنیــا لادیوارێــکی نەبێ نەڕمــابوو ، ئیتــر خانوەکانی‌تر وەك تەختی زەوی‌یان لێ هاتبوو ، دیاربوو ئەو لادیــوارە نەرووخاوە لەگەڵ گەردەلوولی ڕۆژگاردا گــەلێ مل‌ملانێی کــردبوو ، خەرەکی گەردونی بەزاندبوو ، تاقێك لەناو دیوارەکــەدا بوو ، لەنــاویا هەندێ مت‌و مووری‌و شتی منداڵانی تیا مابوو ، لەناو ئەوشتانەدا دەفتەرە شرۆڵەیەکم دۆزی‌یەوە ، لام‌وابوو پاشماوەی حەمایلی پیرەژنە فەرهــاد کوژەکەیە ، یان کتیب دوعای پیرەژنە جادووگەرەکــەی خاتوو زینــە ، بۆیە زوو دەستم دایە ، بۆئەوەی کە گەڕامەوە ناو بەندیخانەی ویژدانەکەم، ئــەگەر ئــەو زیرەلێ‌داوە بــەئاگا هاتبــوو پێی بخــەڵەتێنــم ئیتــر نەتوانێ سەرزەنشم بکات ••• ئەوکــاتەش ئــارەزووە خنکــاوەکــانم

دەخەمەوە ناو گۆڕستانە تاریکەکەی هەستو گیانم٠٠ئای چ ویژدانێکمان بۆ پەروەردەکراوە ! لێم بـووە بە قۆمیسـەری ناحیـەکەمان ، چـەقی دەرگاکەی گرتووە باکی ئەوەی نی‌یە لە دەرەوەو لە ژوورەوە چباسـەو چخواسە ٠٠ دەفتەرەکەم کردەوە ، لەژێر تۆزدا پەرپووت بووبوو تەنهـا دوو لاپەڕەی بە سـاغی مابوو ٠٠ پارچەیەکیش لە موقـەبا رزیوەکەی مابوو، کە سەیرم کرد لە سەری نووسرابوو : ( دەفتەری جەنگاوەرێك ) کە ئەمەم خوێندەوە زوو تۆزی دووپەڕەکەی‌ترم داو خـوێندمنەوە ٠ ٠ لەسەر پەڕەی یەکەم وا نووسرابوو :ـ

( دوێنێ لە دێکەی ئەوبەر نیشتەجێ بووین ، چەند ، ماڵێك بووین، پشتمان لە ناخۆشی‌و ڕوومان لە هیواو ئامانجی پاشەڕۆژی خۆمان نابوو٠٠ ئێواران کە لە ئیش دەبووینەوە ئاراممان دەگـرت ، جـگە لە پێکەنین چیی‌ترمان نەدەزانی٠کە دنیا لەناو تاریکەشـەودا نقوم دەبوو ، ئێـمەیش دەستمان لـــە مل خــەو دەکــرد ، بەیانی زوو ڕادەپەڕین ، پێـش ڕۆژ دەکەوتین‌و سێبەری خۆمان دەبەزان ٠٠ بەئاسوودەیی دەژیاین ٠ ئێوارە وەختەیەك ، هێشتا ئاگری شێوان نەکـــوژابووەوە لەپڕ بـوو بە قیـژەی ئافرەت‌و زیرەی‌منداڵ‌و هات‌و هاواری پیاوانی ناودێ ، هێرش هاتە سـەر دێکە ،ئەوەندەی یەك پارو بجووی دێ کپ‌کرایەوە ، پیاوەکانیان کوشت، ئافرەتەکانیان ڕفان ، منداڵەکانیان بەدیل‌برد ، تەنیا یەك ڕیش سپیی کەنفت قوتاربوو ، ڕۆژگار هەموو هێزی مژیبوو ، ڕیشە سپی‌یەکەیان تاشـی ، هەر ئەوشەوە بە سیکاردێکی کول تەربووشی عەورەتیـان لێ کردەوە . هێشتا جۆگەلەی خوێنەکەی خەسـت نەبووبووەوە ، لەنـاو زەلکاوێك‌دا ششتیانەوەو تەوقێکیـان لە گـەردن کـردو بەجێ‌یان‌هێشـت ٠٠ هێـزی بەسەرخۆیا نەدەشکایەوە دەنا زۆرجار دەستە ئیفلیجـەکانی لە بینەقاقەی

خۆی دەنا کە خۆی بخنکێنێ •• لە دێکەی تەنیشت ئەم دێیەوە واشیان بە پیرەژنێك کردبوو ، لەبەر کیژی شۆخو شەنگ نەیانپەرژابووە سەر پیرەژنەکە •• ئەو لە پیرە کەنفتەکەی ئەم دێیە فامیدەتر بوو ، بۆ خزمێ دەگەڕا کە ماڵداریی لەگەڵ بکات •• ئێ •• بەڵکو بە نەوەی خۆی بگەیەنێ کە کارەساتەکە چۆن بوو نەك بەسەر داخو کەسەردا سەربنێتەوەو بیباتە بن گڵ •• پیاوەکەی دێکەی تەنیشتیانی دۆزیەوە •• دیارە لەم جۆرە هەلوێستانەدا سروشت مەیلی پاشگەزبوونی یاساکانی خۆی دەکاتەوە ، دەبێ پەیامی خۆی بە دوارۆژ بگەیێنێ •• لەوکاتەدا من بووم بە کرۆمۆزۆمێك وەك تەتەر کۆڵی (جین)م بەشاندا درا •• بەشوێن دەزگیرانی خۆمدا گەڕام ، لە ڕەحەمی پیرەژنەکەدا کە دەستمان لە مل یەك کرد بووین بە دووانە (جمك) ، ئەم دێیەمان ئاوەدان کردەوە •• خوشکەکەم داوای ( دڕدووکو باڵابان)ی لێ کردم ، بەشوین دڕدووکو باڵاباندا ڕێی هاتو نەهاتم بڕی ، من لاموابو هەمووشتێ کوتایی پێ هێنراوە ، کەوتمە ولاتێ •• تومەز لەو ولاتەدا هەرایە ، عەزیایەك پەیدا بووبوو ولاتەکەی شڵەژاندبوو •• ئارامی لێ هەڵگرتبوون •• دڕدووکو باڵابانەکەی منیش لای عەزیاکە دەستدەکەوێ •• بۆیە منیش خۆم خستە تەکیان •• ئەوان من بوون ، من ئەوان بووم •• جلی جەنگاوەری دژ بە عەزیاکەم لەبەرکرد •• عەزیاکە یەکێك بوو کەچی لە یەك چاوترووکاندنا هەزارەها عەزیای لێ دەبووەوە ! • بە هەمەرلایەکدا پەلاماری بدایە بەربادی دەکرد••خەڵکەکە لێی نەدەترسان،منداڵە وردە بە دارلاستیق‌و بەردەقانێ ئاسمانیان لێ دەکرد بە ساجی دانە بریشکە ، نیوەڕۆی ئەورۆژە کە دەیەویست بە هەموو قینی خۆی لە ئاسمانەوە ژەهرڕێژی خەڵکەکە بکات،لەپەنای تاشەبەردێکی گەورەدا خۆم شاردەوە لەپڕ ناڵەی تەقینەوەی هێرش‌و بەرنگاری دەستی پێ کردەوە •• نازانم چاوم چووبووە خەو

یان نە •• دیمەنی کاول کردنی شوێنێکی پڕ لە حەشاماتم هاتە بەرچاو •• ئەو تاشە بەردەی کە خۆم لەپەنایا حەشاردابوو وەك باروت تەقی‌یەوەو بوو بە تۆزو چوو بەئاسمانـدا •• لەم‌کاتـەدا من تێکەڵاو بە دایکی خۆم بووبوومەوە ، خەڵکەکە تەماشای تۆزی من‌و تاشە بەردەکانیان دەکرد کە بووبووین بە یەك‌و ، وەك هەور ڕووی ئاسـمانمان گـرتبوو •• من ئەمە نەبووم کە ئێستا هەم ، شتێك بووم بە هەموو شتێ ئاشـنا بووبووم ••• گیانم لەپێناوی هێنانەدیی ئەو پەیامەدا ـ دڕدووکو بالابان ـ بەخت کرد•• شەهید بووم ، کە پارچەکانی لەشم ئەبوون بە تۆز ، لەخۆشی‌یا دەتلامەوە، پێدەکەنیم ، پێکەنینەکەم مزدەیەکی دەگەیاند کە ئێستـا نـازانم چـۆنی بگێرمەوە ، بە دەم‌وزار نەبوو ، بۆیە بە زار ناگێـڕدرێتەوە ، لە ئاسـمان پاکتر بوو ، لە ئەستێرەی پایز ورشەدارتر بوو ، لە پێکەنین‌و ناوچـاوی منداڵان بێ‌گەردو بێ‌سـنوورتر بـوو ، هەموو جیـهانم لێ بووبوو بـە کتێبێکی بچووك ئەگەر بمویستایە لە یەك چرکەدا چەندەها جار پەنجەم بەم‌پەڕو بەوپەڕیا دەهێناو دەبرد •• چی چـوار چێوەی ڕۆژگار هەبوون لە سەرەتای بوونیانەوە تا ڕۆژی عەزیاکە وەك سـوخمەی دەزگیرانەکەم بەئاسانی دەمترازاندن •• ئەوەی بووەو ڕووی داوەو لە گەورەو بچووك لەوڕۆژەوە کـە ڕۆژ تیـا لەدایك‌بـووە ، وەك دێـڕە نـووسراوێك بـە تروسکەی یەك سەرنج هەموویم دەخوێندەوە • لەگەڵ دەنگ‌و ڕەنگ‌و تیشك‌و شەپۆلی ئەلکترۆنی کارەبادا ئاشنا بووبووین ، بەیەکەوە سەمامان دەکرد •• ئەستێرەکانی گەردوون ، چاوەشـارکێیان لەگەڵ دەکـردم ، ئەگەر بمویستایە لە یەك چاوتروکاندنا هەموویانم وەك دەنکە مرواری لە پەنجەی خواستما دەهۆنی‌یەوە • هەروەها یەك چـرکەی (زەمـەن)م شی‌دەکردەوەو دەمتوانی بیکەم بە چەندەهـا ملیۆن بەشـەوە ، لە هـەر بەشێـکیا سـەدەها سـازو ئـاواز بـڵێم • • هـەر حەوت حەزارەتەکەی

جیهان ، نا ، با بڵێم هەر حەوت مۆرەکەی ئادەمیزادم دەکرد بە پارچە هۆنراوەیەکی نەخوێنراوەی حەوت دێرپی شاعیرێکی نەناسراو •• هەستیشم بەوە دەکرد کە ئایا من مردووم یان زیندووم ، بەلام مردنو ژیان لەلام دوو وشەی چرووکو بێمانا بوون •• لە هەموو شتێ حاڵی بووم •• نازانم چۆن بوو لەپڕ مەلای خەتیم دی ، بەکر مەرگەوەری کردبوو بە میرزای خۆی ، بەلام تەنیا لیستەی ناوی برادەرانی خۆی پێ دەنووسی‌یەوە •• خۆیشی خەریکی نووسینەوەی مێژووی خۆی بوو •• ئاگری دۆزەخ کوژابووەوە ، خەڵك لەبەر کوژانەوەی ئاگرەکە بۆگەن بووبوون •• جێ نەدەبووەوە • ئاگام لێ بوو ، چاودێری دۆزەخ لەبەر بێجێیی دەری‌دەکردن •• ئەویش لای‌وابوو بۆ شوێنێکی خراپ‌تری دەبەن ، هاواری دەکرد ، نا ، جێگەم خۆشە •• هەروەها شەیتانم دی بە زەردەخەنەیەکی پڕ بەتێزەوە دەیوت : دە وەرە ئەمە بە شت بزانە •• لەوەتی هەم بەیەکەوەین ، خۆی بە ویستی خۆی بڕیاری داوە کە خۆشم‌بوێ دژ بە ویستو بڕیارەکانی نەجووڵێمەوە •• کەچی دوێنێ خوی ڕاشکەز بووەتەوەو خەتای من دەگری •• یەك لاشەیە دوو سەری پێوەیە ، لەودیوەوە شتێکی دەوێ‌و لەم‌دیوەوە شتێکی‌ترە ! •• من کەوتوومە نێوان دوو شتی دژ بە یەك ، دوو نەهەنگن کامیان قووتم‌بدا ئەوی‌تریان خەتابارم دەکا •• خواستی‌وای ویست دڵی شتێکی‌تر •• ئەمە چیی پێ‌دەڵێن !؟ •• باشە لەنێوان ئەو دوو بەردەئاشا من چی‌بکەم ؟ • من وەك ئەو فریشتە هەڵو هەرزانە نیم ، ڕاستی‌یەکە دەزانن بەلام خۆیان لەئاستی گێل‌دەکەن ! جگە لە خۆی کەسی‌ترم ناوێ با خۆیشی بڵێ منت نەوێ با فەرمانەکانم پووچەڵ نەبنەوە ، من هەر ئەوەم دەوێ چونکە لە من بالاترە ، دەنا دەمزانی چی دەکەم • چی دەکات با بیکات ، کەس ناتوانێ سەر لە من بشێوێنێ •• من لە ئاگر دروست‌کراوم کەس ناتوانی بمکات

بە قوڕ ، ئەمە ویستی خۆیەتی ، منیش نـەبم هـەمووشتێ وەك نیسـكی بێبەرویشتی لێ دێ ..

بەڵێ بە چاكی لە قسەكانی حەزرەتی ئەهریمەن حاڵی نەبووم ، بەڵام مەسەلەكەی بەدرشتی دیارە ..

خوشكە ئازەیزەكەم ، عەزیاكە خەریـكە دەبـەزێ ، بەمزوانـە دڕدووكو باڵەبانەكەت بۆ دەهێنم ، دەبـێ ئەوەش بـزانی هێشتا زووە ، ئادەمیزاد تازە لە پێستی خۆی هاتووەتە دەرەوە ، خەریكی گرو گاڵ كردنە ، بەڵام هەر بەندی تاریكەستانی خۆیەتی، ئەوەش كە پێی‌دەڵێن ویژدان خۆی بۆخۆی تاشیو یەتی، پەروەردەی دەستی حەوت مۆرە ناهەموارەكەیە...)،

× × ×

لـە پەڕەی دووەمـی دەفتـەری جەنگاوەرەكەدا نووسرابوو :ـ

(سیمرخەكە ؛ كەی تێر دەبـی .. لەیادمـە لە هەمـوو شـوێنێ دەنگ بڵاوبووەوە كە باڵندەیەك پەیدابووە ، گوڵو گەڕو شەڵو كوێرو كەچەڵ چاكدەكاتەوە ، لەسەر لووتكەی چیایەكی بەرز ڕاوەستابوو ؛ بە قوڕگی نەقارەی دەژەند ، لە دەنووكیا هەزار كون هەبوو ، لە هەر كونێكەوە هەزار سازو ئاواز دەردەچوو . بە باڵی سێبەری بۆ ئـەو خەڵكە دەكرد كە لە دەشتەكەی بەردەمیا خڕدەبوونەوەو گوێیان لێ دەگرتو بەئومێدی چاكبوونـەوە دەبـوون .. كـە خەڵـكەكە كۆدەبوونـەوە بە دەنــگە هەزارتەرزەكەی سازو سەمتـووری بـۆئەژەندن ، خەڵـكەكە خامـۆش دەبوون ، ئەوجا دەسی دەبرد هەمووی دەماشیەوەو مەڵۆشی دەكردنو قووتی‌دەدان ؛ هەموو رۆژێ ، هەموو زەمێ ئەمە بەزمی بوو ، ئەوەی دەڕۆیشت نەدەگەڕایەوە تا ڕاستی مەسەلەكە بۆ خەڵك ساغ‌بكاتەوە .. تاكو تروو كێ خەڵك مابوون ، ئەوانیشی بـە هێزی سازو ئاوازەكانی

خڕ کردەوە ، زۆری خوێند ، زۆری ژەند ، تا دوا هەناسەی فووی پیا کرد ، ئەوەی مابوو خڕبوونەوە ، لەپڕ ئەوانیشی ماشی‌یەوەو قووتی‌دان • کە خۆی کەوتە گیانەڵاوە لەکاتی سەرەمەرگدا دەیوت : ئاخ لەبرسا مردم •• بریا پارووێکی‌ترم پێش مردنم بخواردایە !••) •

کە ئەم دوو پەڕەم خوێندەوە ، ئیتر لەوە زیاتر نەڕۆیشتم زوو پەلی حەزو ئارەزووەکانی خومم وەك منداڵە کۆرپەی بێ‌دەرەتانو بێ‌نەوا بەشوێن خۆما ڕاکێشاو گەڕاینەوە ، لە دەرگای کەلاوە کۆنەکەی لەشمدا ، بەرامبەر بە وێژدانە خامۆش بووەکەم هەردوو پەڕەی دەفتەری جەنگاوەرەکەم لەناو کلپەی هەستما لوول‌داو لە پەنایەکدا بەدیواری بێ‌هەدەریمدا هەڵمواسین ، تا دەرگەوانی جیهانە تاریکەکەم بزانێ کە ئارەزووەکانم نەمردوون ؛ ماون ، خەریکە باڵەفڕ دەبن ••

**هەولێر ٩ـ١١ـ١٩٧٦**

خۆر بەو مەزنی‌یە کە هەیەو ئەو هەموو ئەستێرانە بەدەوریا ئەسووڕێنەوە ، ئەوەی لەیادناچێ کە میوەیەك بەسەر درەختێکەوە ماوە پێ‌بگا •• وەك بڵێی لەم گەردوونە پانو بەرینەدا کارێکی‌تری نەبێ بیکا •

**گالیلۆ**

# سەرنجەکانی پیرەمێردێکی پێشکاو

**عەبدوڵلا قەرەداغی**

پێم شکا ، سەرنجی ساواشم ،...
سنووری حەوشەمان ، سنووری رەویەتی
ــ هاوسەرم دە هەڵسە دەرگاکەی حەوشەمان وازبکە
با بزەو پاراویی منالی ئەم شارە ،...
لە دڵما بنیاتی ئاواتی هەمیشەی ژیانم دابنێن
بڕوانە هاوسەرم ،
چ هێزێك لە بزەی منالا گەشبینیو ئارامیمان ئەداتێ !؟
سەد خۆزگە توانیبام منالان لە جەنگو ،
تەوژمی زۆرداری دووربخەم
سەد خۆزگە توانیبام منالی سەرزەمین کۆبکەم
کراسو خواردنو خەوتنیان وەك یەك بێت
دیمەنی ئازارو مردنیان نەگاتێ

× × ×

ــ هاوسەرم دە هەڵسە دەرگاکەی حەوشەمان وازبکە
دیمەنی سەرجادەی ئەم شارەم پێ خۆشە

کاتێ خۆر ئۆردووگای ئارامیجێدێڵێو ،
سەربازی تاریکیو بێدەنگی ڕاوئەنێ ،...
لە شارا جموجووڵ رووەتی ڕەنجبەران هەڵئەگرێ
خوێنی نوێ دەماری شەقامو باخچەکان ئاوئەدات
گشت دەمێك سوورایی کوڵمی خۆر ماچئەکات
گشت دڵێك مەشکەدۆی ئاواتی ئەژەنێ

× × ×

بێوەر نیم ،...
بەڵام خەم دەروونم بە ماچی گەرمی سۆز تەڕ ئەکات
نامەوێ لە بەستەو گۆرانیی هەزاران دوورکەوم
خۆ بزەی هەتیوێك ،...
بەهەشتێك لە دڵما ئەڕوێنێت ..
گۆرانیی جووتیارێك ،...
سەرتاپای ئەندێشەم پڕئەکات لە سەماو هەڵبەڕکێ
کوتەکی ئاسنگەر ،...
ئاوازی ژیانمەو قەشەنگیی ژیانم بۆ ئەکات بە دەنگێك ،...
بەردەوام سەرنجم ئەدوێنێت
ناڵیش ،....
رووباری نەمرییەو تینوێتیی ئاواتمی پێ ئەشکێ
+ داخەکەم ، تینۆیتی ئاواتت بە ئاوی خۆت ناشکێ
— تۆ مەگرییو برینم قووڵمەکە
با ناڵمان نەبێت ،
ناڵی گشت کەسێك ناڵی ئێمەیە

ژیانمان بەسەربرد
لە مەرگیش سڵناکەم
بەڵام ئەشک لە چاوما جیایی من‌و تۆ ئەبینی‌و ••
وەك نمە لەسەرخۆ ورد ئەتکێ

× × ×

ـــ دە مەگری هاوسەرم
برسێتی‌و تینوێتیی جارانمان ،
نیشانەی دڵسۆزی‌و بەرزیی تۆن
لەبیرمە ،••
بەشێکی ژیانمان تەنها چاو نانی وشك خۆراکی ئێمە بوو
ـــ جارجاریش ، پاش لافاو ـ تۆ چیلکەو کۆترەدار ،••
سەرشانی ناسکتی دەئێشاند
سکاڵام لێت نەبیست ،
نەخۆش بووم ، نەتئەهێشت بێ ئاگر بمێنم
ئەشت‌وت : ـ کاکەوڵای هاوسێمان ،
بە زەبری نەخۆشی‌و سەرما مرد ،
ئیتر چۆن یادی تۆ لە دڵ‌و دەروونما نەژێنم !؟

× × ×

ئای سەختە مرۆڤێك ناچاری جیایی‌و خەم بکرێ
بەقەد ئەو ئازارەی وا تووشی دایك ئەبێت ،••
گەر کۆرپەی بەر مەمکەی لە مەمکی دووربخرێ
بەقەد ئەو هاوارەی لە هەستی خنکاودا بانگ ئەدات ،••

گەر لافاو بیاتو دەروازەی پەناگای بەروودا دابخرێ
بەقەد ئەو کینەیەی لەناخی مرۆڤدا ئەسرەوێ ،..
گەر سایەی داگیرکەر لە خاكو ولاتیا ،..
هەناسەی ئازادی رابگرێ
بەقەد گشت ئازاری ژیانم بێکاریم لا سەختە
چەکوشێك هۆگری تەمەنو ژینم بێت ،
چۆن ئێستا جێی بێلم ...!؟
« رۆژباش »ی پڕ خەندەو ئاوازی گشت کاتێك ،
ئارەقەی ماندووبوون ،
داستانی ئەوینی ئەبەدیی کرێکار ،.
لەگەڵ باو بارانو ئاگری کوورەدا ،..
ئەمانەم بەجێ‌هێشت
...... چۆن نەگریم !؟
ئای کاتێ تاوێرم ئەشکاندو ئەمزانی ئەبنە گەچ،..
ئەمزانی بەشداری کارێکم ،
مەردمی ئەم شارە لە چنگی نەخۆشی دوورئەخات
هەستێکی زۆر پیرۆز سەرنجی ئەدوانم
ئەوکاتەی ماندووبوون ،
ڕوومەتمی تەرپۆشی ئارەقەو تۆز ئەکرد ،..
سروودی رووناکی لە دڵما سەوزئەبوو

× × ×

لێدانی چەکوشم لە دەنگی شمشاڵی شەفینێك خۆشتر بوو
...... چۆن نەگریم !؟

× × ×

نــه‌ه ناگریم
رۆژێك دێت ئازاری ئه‌م پێیه‌م وه‌كو خه‌ون بێته یاد
دووباره چه‌كوشم له‌ده‌ستدا بسره‌وێ ،...
قه‌دپاڵی ئه‌و چیا سه‌ختانه بدوێنم
رۆژێك دێت گوڵاڵه‌ی ئاواتم ،
له سه‌ختیی تاوێرا تیر بڕوێ
ــ هاوسه‌رم جیهانمان زۆر جوانه‌و ژیانیش زۆر خۆشه
ده هه‌ڵسه ده‌رگاكه‌ی حه‌وشه‌مان وازبكه
حه‌زناكه‌م ده‌رگامان به ڕووی كه‌س دابخرێ
ده مه‌گری
با بزه‌ت وه‌ك كۆتر ئاسمانی ئه‌ندێشه‌م دابگرێ
با بزه‌ت فرمێسكی من بسڕێ

**كفری ۳۱ـ۱۰ـ۱۹۸۰**

پیاو بۆئه‌وه‌ی ببێ به شاعیر ، یا ئه‌بێ دڵی له ئافره‌تێكی جوان بچێ ، یا زۆر كلۆڵ‌و سیاچاره بێ .

**لۆرد بایرۆن**

# تابلۆیێك

محمد موکری
پێشکەشە
بە ( محمد عارف )ی هونەرمەند

-۱-

دانیشتوان ۰ ۰ ۰ بەرێزان

هەمووتان دەزانن ، تا ئەم بەرهەمەشانۆیی‌یەمان ئامادە کردووە ، چەنێ ئەرکمان چێژتووەو چەندەها کەشمەکەش ڕێی پێ گرتووین ۰۰۰ ئینجا داوای ئێمە ئەوە نی‌یە تکای بێدەنگی‌و پاراستنی یاسای هێمنیتان لێ بکەین ، نەخێر ۰۰۰ نامانەوێ بەرهەمەکەیشمان هەڵسەنگێنن ۰۰۰ نامانەوێ ئەوەیشتان پێ بسەلمێنین کە ئەم چیرۆکە ، چیرۆکی هەر یەکە لە ئێوەیە ، پێوەندی بە دەم‌و زمان‌و گوێ‌و خەوبینینتانەوە هەیە ۰ ۰ پێوەندی بە خوێن‌و ڕژانەوەو تەو ڕیستن‌و هەموو وردە شانەکانی لەشتانەوە هەیە ۰ ۰ ۰ پێوەندی بە سۆزو ڕاستی‌و درۆو دڵسۆزی‌و دووڕوویی‌و خێزان‌و دڵداریی هەر یەکێکتانەوە هەیە ۰۰ هەروەها نامانەوێ مافی سەرپشك‌بوونتان بدەینێ‌و دەسەڵاتی هەڵبژاردن‌و فەرمان‌دان بدەینە دەستتان ۰۰۰۰ ئەوەش بزانن ئەکتەرەکان قایل نابن ناویان بهێنین ۰ گەر سەرپێچیش بکەین ئەوە تەنها خوێندنەوەی ناوەکانیان هەزاران هەزار ساڵی

دەوێ جگە لەوەی نـاوی زۆربـەی ئەکتەرەکان نازانـین ، لەبەرئەوەی مردوونو زۆربەشیان هێشتا لەدایکنەبوون ... بەلاتانەوە سەیر نەبێ ئەگەر بڵێین :ــ ...

« هێزێ ... هێزێکی زۆر گەورە ... لە ژوور توانامانەوەیـــە دەستنیشانی کردووینو فەرمانی ڕەوای خۆی بەسەرا داوین ، ئەویش ئەوەیە لە یەککاىدا ئەکتەرو تەماشاکەر بینو هەریەکەمانیش وشەیێکی ئەم چیرۆکە بین ، لە هەمانکاتیشدا هەریەکەمان سـەرتاسەری چـیرۆکەکە بین » ...

بەڕێزان .... هەموو دەزانن کە ئێستا :ــ

بەرەبەیانەو تازە ڕۆژ هەڵهاتووە . پاش چەند ساعاتێکیدی ، یادنامە نهێنییەکانتان ... ئەو یادانەی کە تا ئێستاش نەنووسراونەتەوە ....

قسەکانتان :ــ ئەوانەی کە هێشتا لەدەمتانەوە نەهاتوونەتە دەرێ ...

خەونەکانتان :ــ ئەوانەی نەیشتانبینیون ...

ڕێگاکانتان :ــ ئەوانەی کە تائێستا هەنگاوتان بەسەردا نەناون ، ئەو بەفرو بارانو ڕەشەباو گەردەلوولانەی نەباریونو هەڵیان نەکردووە ...

تا ئەو جگەرانەی :ــ دووکەڵەکانیان نەکێشراونو ئاگرەکانیان بـە شەوگاری بێدەنگیتان ... نامۆن !!.

هەموو ئەمانە... تێکڕا ئەمانە :ــ بەشێکی زۆر زۆر بجووکی یەکێك لە پەردەکانی ئەم شانۆنامەیەن ..

بەڕێزان .... داواتـان لێدەکەین ، لـە کاتـی دەستپێکردنی شـانۆبازییەکەدا دان بەخۆتانـا بگرنو نەترسـن ... ئەگەرچی ئەم

داوایەمان گەلێ گرانەو بەدەگمەن لەم جیهانە بەرینەدا کەسێك ئەبێ لە خۆی نەترسێ !!...

بەڵام بۆئەوەی بتوانین رووداوی شانۆنامەکە بۆ منالەکان بگێڕینەوە دەبێ نەترسین !!...

لێم‌ببوورن ، ماندوو بووم ...
پاش چەند ساتێکی‌دی بەسەرتاندە کەمەوە ...

نا ... نا ... نا بەجێتان‌ناهێڵم ، زۆر خۆشم دەوێن ، ... گەرچی ماندوم بەڵام وا پێویست دەکات ئەم وتارە تەواو بکەمو رێی ئەوەتـــان نەدەمێ بپرسن ... نامەوێ بڵێن :ـ لەم کاتەدا شانۆنامە یانێ‌چی ؟ .. لە کاتێکدا کە تەنها خانوویێك لەم شارەدا بەپێوە نەماوە ، بوومەلەرزەو لافاو رقی خـــۆی تفاندووە بەسەریا ، دەشێ بـــڵێن :ـ ئەمـــە نەفرەتی خواوەندی گەورەیە وا ئەم‌شارە بەدبەختەی ئێمە بووە بە مەڵبەندی هەموو نەگبەتی‌یەك !!.

رەنگە بڵێن :ـ لەم کاتەدا پێویستیمان بە نانەواخانە هەیە ، ئەکتەرەکان هەویرمان بۆ بشێلن ...

پێویستیمان بە رەنجبەرو پالاو جووتیار هەیە زەوی‌یەکانمان خاوێن بکەنەوە !!.

پێویستیمان بە گۆڕهەڵکەن هەیە مردووە گەنیوەکانمان بشارنەوە !!.
پێویستیمان بە کرێکار هەیە بەری ڕووبارو جۆگەکان پاك‌کەنەوە ، تا ئەم مەردومە بەدبەختانە چڵکەکانیان داشۆن !!.

بەڕێزان : ئەم پرسیارانە لە ئاوێنەکانتان بکەن... وەڵامی ڕاستی.. وەڵامی دروست ..

وەڵامی بەجێی لێ وەردەگرن !!

بەڕێزان ••• پێش ئەوەی کۆتایی بەم وتارەم بێنم ، دەمەوێ بڵێم تەنها من دەرهێنی ئەم شانۆ بازی‌یە نیم ، منیش وەکو ••• ئێوە ئەکتەرو •• تەماشاکەرم !! چیرۆکی ئەم شانۆنامەیەشم •

ئێوەش هەموو ••• وەکو من ••• دەرهێنن !!!

-٢-

پشت لە دانیشتووان دەکات‌و لەبەرخۆیەوە دەڵێ :-

« بریا باران‌و لافاو ئەم‌شانۆیەی لێ تێك‌نەدەداین •••

نا •• باوەڕ ناکەم • ئەمجارە ئەگەر بەردو ئاگریش‌بباری کەسێك جێگەکەی خۆی بەجێ‌ناهێڵێ ••

باشە بۆ کوێ دەچێ ••؟ ••

لەم شارەدا شوێنێك ماوە ئوقرەی تێدا بگرێ‌و بحەسێتەوەو خۆی تیا لە تەڕبوون بپارێزێ ••••

نەخێر ••• نەخێر ئەگەر ئاگر بباری شانۆیازی‌یەکەمان هەر دەست پێ‌دەکات !•••

بریا بومەلەرزە ئەم هۆڵەی وا تێك نەدەدا ••• جا چی‌یە ••• با ئەم هۆڵە سەریشی نەگیرابێ ، با کورسیشی تیا نەبێ •••

ئەمجارە شانۆکەمان هەر دەست پێ‌دەکات • هەر هەر ، هەر ••• تـا کۆتایی •••• »

سووك لە درزی پەردەی شانۆکەوە دەچێتە ئەودیو ••• دانیشتوان

لەگەڵ لە چاو ونبوونی دەرهێندا مقۆ مقۆ کەوتە ناویانەوەو غەڵبە غەڵێکی ناسازیان تیادا پەیدابوو ، پرسیاری جۆربەجۆر وەکو زەڕنەقووتەی ونبو لە دایکی ، لە دەمی دانیشتواندا باڵەفرتێیان بوو ، بڕیان نەدەکردە هێلانەی گوێکانو دەکەوتن ...

دەنگەکان ئەوەندە تێکەڵ بوون ، کەس لە کەس نەدەگەیشت ..
کەسێکیش شتێکی دیاری کراوی نەبوو بیدرکێنێ ....

لەم دەنگە ناسازانە بێزار بوون ...

کەسێکیان نەیزانی چ هێزێکی نادیاریو بەتین وا جـووتەپێ ڕەپ وەستاندیانیو بێدەنگیو کپ بوونی لکاند بە دەموچاویانداو کاتێ کـــە پەردەی شانۆکە لادرا ...

-٣-

نقەیان لە خۆیان بڕیبو ، چاوەڕوانییان دەمژی، سەعاتێ، سەعاتو نیوێك ، دوو ، سێ ، بێزار بوون ، چاوەڕوانییەکەیان درێژەی کێشا ، لەپڕ بێزارییەکەیان ڕەوییەوە ، کاتێ ئەو پەردە تەنکەی سەر تابلۆی ناو شانۆکەیان وەلادا .. بە وردی سەرنجـی تابلۆکەیـان دەدا ، کـەم کەسیان هەوڵی کردنەوەی تەلیسمو ڕەنـگو هێڵو مانـای تابلـۆکەی دەدا . . .

زۆربەیان هەر سەیریان دەکرد وبەس .

وردە وردە زیاترو وردتر تێکەڵ بە جیهانی تابلۆکە دەبوون، هەریەکە لە تەمەنی ئەم کاتە تایبەتییەیدا لە نێوانی هێڵو ڕەنگی وێنەکاندا ، جۆرە باریکە ڕێیەکی بۆ داهاتووی دەدۆزییەوە ..

هەندێ لە دانیشتوان وایان دەزانی بەپێچەوانەی هەموو یاسـاکانی سروشت پرچە زەردەکەی ئافرەتە سوارەکەی ناو تابلۆکە لە نووکەوە سپی بووە ، ئەو وردە گریانەی نووکی پرچی ئافرەتەکەو مووی یاڵـە سپی یەکەی ئەو ئەسپە سەرکێشەیان نەدەبینی !!

ڕەنگی بریقەی ئەو ناڵو بزمارانەی دووپەلی بەرزەوەبوی ئەسپە سپی یەکە ئەگەر چی لە ڕەنـگدانەوەی تیشـکی ئەو کەرتـە هەتاوە زەرد هەڵگەڕاوەی ژێر سکی ئەسپەکە بوو کە ئاسۆی ئەو بیابانە کرکای کرکە لە ئامێزی نابوو ، ناولنگی ئەسپەکەی بە ڕەنگێـکی زیوین و بریقـەدار ڕۆشن کردبوەوەو سەرنجی زۆربەی خەڵـکەکە چەقیبـووە سەر ئـەم بەشە بچووکەی تابلۆکەوە ٠

ئەو باریکەڕێ ئالۆزاوانەی زەوی یە بۆرەکە ، وەکو جووتە پێوەندێکی چەسپ تا هەردوو ئەژنۆی دوو پەلی پاشەوەی ئەسپەکەی جەڕاندبوو ٠٠٠
هەندێ لە تەماشاکەران بێ ئەوەی دەرك بەو نهێنی یە نادیارە بکەن کە باڵیان پێوە دەنێ ، دەستیان بە ئەژنۆیاندا دەهێنا وەکو ئـەوەی شتێـکی قورس داماڵنەخوارێ ٠٠

ئافرەتە ڕووتە سوارەکەی سەر ئەسپە سپی یەکە چاوی بڕیبووە ئەو تاقە دارە پیرو کرمۆڵەی زەوی یە ڕووتەکە کە تەنها دوو قەلەڕەشی نێرو مێی گرتبووە پۆپەی چڵەکانی ٠٠

لە نێوانی دەستی چەپی ئافرەتە ڕووتەکەوە چەند باریکە هێڵێـکی سـووری ئـالۆزاو شـۆڕ ببووەوە لـە هێڵێـکی پاندا بەسـەر سـنگیەوە یەکیان گرتبوو و لەنێوانی هەردوو مەمکیا لەشێوەی دژوارترین دەربەندو بەخوڕترین ڕووبار لە چوارچێوەی چەند ڕەنگێکی تێکەڵو پێکەڵدا بـە دەستو پەنجەی هونەرمەندێکی ناسراو نەخشێنرابوون ٠٠٠

جگە لە تابلۆکە کەسێك لەسەر شانۆکە نەبوو ، زیـاتر لە چەند سەعاتێ بێدەنگیو کپی تێکەڵ بـە سەرنجی دانیشتووان بـوو لەنێوانی تابلۆکەدا دەتوایەوە. پاش چەند سەعاتێکیدیش لە بێدەنگیو باوێشکدان، وردە وردە لەناو دانیشتواندا لە دەمی کەسێکەوە بە قەڵەمباز بـۆ دەمی ئەویدی بازی دەهاویشت. هەندێکیان گێژ بوون .. تا دەمەو ئێوارە تەنها بێدەنگیو باوێشکدان نەبێ هیچ جووڵەو ورتەیێك لەو ناوەدا نەدەهات .. هێدیهێدی شار تاریك هەڵگەڕاو شانۆیش لە ناو تاریکیدا ون بوو ...

-٤-

ئافـرەتی ...

بە دوو چراوە ناوەندی شانـۆی ڕووناك کردەوە . یەکێـك لـە چراکانی لەژێر تابلۆکەدا دانـا .. ئـەویدیشیان هـەر بەدەستیەوە بـوو پرتەبرتی گڕی چرای ژێر تابلۆکە سەمای بە سێبەری ئەسپە سپییەکەو دارە پیرو کرمۆڵەکەو قەلەڕەشەکانو ئافرەتە ڕووتەکە دەکرد.. سەرنجی دانیشتوانیش بەسترابوو بە گڕی چراکەوەو لە گەڵ گڕەکەدا سەرنجیان بەرز ونزم دەبووەوە .....

سەمای وێنەکانی تابلۆکە کپو خامۆش بووەوە کاتێ کە دوا دڵۆپی نەوتی چراکە خۆی بۆ ڕۆشنایـی خـستە نێوان نەبـوونو گومانـەوە ، ئافرەتەکەی سەر شانۆکەیش بـە چـراکەی دەستیەوە هـەر ئـەم سەرو ئەوسەری شانۆکەی پەی دەکرد . جار جارێ چراکەی لە دەستی چەپەوە بۆ دەستی ڕاسـتی دەگواستـەوە ، جارجارێکیش بـە هەردوو دەسـت دەیگرت ..... ئەمجارە سەرنجی دانیشتووان ئاڵابووە هەنگاوەکانی ئافرەتەکەوە، هەندێ کەسیش هەنگاوەکانییان دەژمارد ... لەپڕ وەستا ،

بەتاقە دەستێکی پارچە پارچە جلو بەرگەکەی بەری داکەندو بەگڕی چراکە سووتاندنی و فووی لە هەڵاوو گڕی ئاگرەکە دەکردو بەرەوڕووی دانیشتووان ڕەوانەی دەکرد •••

ڕووت ڕووت بووەوە ، دانیشت ، هەردوو لنگی داچەقاند ، چراکەی لەنێوان لنگیا ، دانا ••

خەڵکەکە واقیان وڕ ما ، ترس ڕەنگی پێ گۆڕین ، تفیان پێ قووت نەدەدرا ، ورتە لە دەمی کەسیشەوە نەدەهاتە دەرێ ، وەکو بت مەیبوون چاویشیان چەقیبووە ناو لنگی ئافرەتەکەوە ،••• ئافرەتەکە ئارەقی شین و مۆری دەردەدا ، لێوەکانی خۆی دەگەزی ، پەنجەکانی دەستی هەڵپێکابوو لەسەر سکی ڕایگرتبوون ••

دەنگی یەکەم قیژەو زیکە وەکو چەخماخەو ناڵەی هەورە تریشقە برووسکەیێکی تووڕەی ئاگراویی لە گلێنەی دانیشتووانا هەڵساندو هەریەکە لەجێی خۆیەوە ڕاپەڕی ، هەناسەی سنگیانی هێنایە جۆش وەکو بورکانێکی ئامادەی تەقین • سنگیان بەرزو نزم دەبووەوە ••• بەهێمنی دانیشتنەوە ، هەموو چاوەڕوانی کارەساتێکی نادیاری و دژواریان دەکرد کە هەموو نەگبەتی یەکەیان هەڵلوشێ • قیژەو هاواری ئافرەتەکە لە هەموو کەلاوە خاپوور کراوەکانی شاری وێرانبوودا دەنگی دەدایەوە ، تا دەهات ناڵەو ترکەی بەرزدەبووەوە •••

لە سەرەتای تەمەنی ئەم شەوەدا هەموو گیان لەبەرەکانی شار هەراسان بوون ، ئافرەتەکەیش هەر هاواری دەکردو گازی لە لێوەکانی خۆی دەگرت ، سەری بۆ ناولنگی خۆی شۆڕکردبووەوە ، پرچی خۆی بە توندی دەکێشا، چراکەش وردە وردە گڕەکەی بەرزدەبووەوەو ناولنگی

ئافرەتـەکەی ڕۆشن‌تـر دەکـردەوە ، شەپۆلـی دەنـگی قیژەو ناڵەی ئافرەتـەکەکش وەکـو ڕەشەبایێـکی مەسـت سەماینێکی شێتانەی بە گڕی چراکە دەکردو نەی‌دەهێشت لەسەر ڕۆخی داساکێ ... خەڵکەکەش قیژەو سامناکی‌و نادیاری‌یان هەڵدەفڕی ... لە ناولنگی ئافرەتەکەوە وەکو زەوی‌یەکی سکپڕی نەوت ، خوێن فوارەی کرد ، سەر شانۆکەی سوور کرد، جۆگەی بەست، داچۆڕایە خوارەوە، لەژێر پێی دانیشتوواندا گۆمی بەست، مەیی، هەموو زەوی سوور هەڵگەڕا، ئافرەتەکە لە قیژە کەوت ، چراکەی ناولنگی وەکوو گەمی‌یەکی ڕێ‌لێ‌ون‌بوو بوو لەنـاو دەریایێـکی وروژاودا بەشەکەتی‌یەوە ئەم‌شان‌و ئەوشانی دەکرد ... چەن سەعاتێ ، ئافرەتەکە لەنێو خوێنی‌خۆیدا گەوزا، ئەم‌دیوو ئەودیوی دەکرد،بەنکەنکەوە هەڵسایەوە سەر پێ ، جەستە خوێناوی‌یەکەی لە تابلۆکە خشاندو ئەویشی سوورکرد ...

لەنزیـکی چـراکەوە دیسانەوە لنـگی ڕووبەڕووی دانیشتوان داچەقاند ... ڕەنگی دەم‌وچاوی سوور هەڵگەڕا ، وردە وردە بەئاستەم پێکەنینێکی پچڕپچڕ لەسەر لێوەکانیەوە پەرش‌دەبووەوە ...

لە ناولنگیشیەوە سەری مناڵێ بەرەو دەرەوە دەجوولا ...

لە ژێر پێی دانیشتووانیشدا خوێنە مەیبوەکە دەقڵیشایەوە ، چرۆی گوڵە نێرگس سەریان بەرزدەکردەوە ....

کاتێ گزنگی بەرەبەیان دەم‌وچاوی دانیشتووانی شۆردەوە ، جەستەی هەموو مناڵەکە هاتە دەرێ ، چرۆ نێرگسەکان دەمیان‌کردەوە ، لەگەڵ ڕەوتی هەتاوی ئاسماندا ، مناڵەکەی سەر شانۆ گەورە دەبو ، ئافرەتەکـە کشایەوە بۆ ئەودیوی شانۆ . مناڵە گەورە بووەکە بە تەنها مایەوە ، باڵای

ئەوەندەی باڵای دەرهێنەکە بەرزبووەوە ، خەڵکەکە بەحەپەساوی یەوە سەیریاندەکرد ، وایاندەزانی لە ئاوێنەدا خۆیان دەبینن ، لە هەموویان دەچوو ...

تێکڕا هەموویان هەڵسانە سەر پێ و ....

**سەماوە ـ ئایاری ۱۹۷۷**

# گۆرانی‌یه نه‌مره‌كا ماچمێ

**عوسمان هه‌ورامی**

ئازیز كه شادی به‌رپڕیا
جه به‌هه‌شتو كویسانی ،
فڕه‌شا دانا دۆزه‌خو
گڕه‌و كوشنده‌و گه‌رمیانی
كویسان دیـا شۆنیشه‌ره
ده‌روون گڕه‌ش وه‌ربی‌یه‌نه
ته‌ره بیۆ به قۆته‌ره (١)

× × ×

كه ژه‌ره‌ژی خاڵو مێڵ دار
دووه دریـا ،
گواره‌كێش هورپرووزیێو
جه لانه‌كه‌ش ته‌ره كریا ،
ڕوه‌و هه‌وارگه‌ی چۆڵ دیا
كه‌سش نه‌دی ،

---

(١) ماچمی : ئه‌ڵێین • به‌ڕپڕیا : ده‌رپـه‌ڕێنرا • دیـا شۆنیشه‌ره : ڕوانی به‌دوایا • وه‌ربی‌یه‌نه : تێبه‌ربووه • ته‌ره : داربه‌ڕوو • بیۆ : بوه‌وه ••••

جه داخێنه فنجووقش کەرد
پەی دووری تا جه چەم بڕیا (٢)

× × ×

گەشتو سەیران ئەرامەندەن
کۆڕو گوڵاڵاما کزا
گرد جارێنــه
دداتــو شادیشا کەندەن
نازدارەکێ نادیارێنێ
بدانێ لووتکەو سەربەرزا
ئەجیۆ خامۆشی باڵش شان
ملو دەرەو کەشەکارە
سروشت گردش بێئاوازا
دوور جه باڵاو یاری گیانی
ئاوەدانیی سەرزەمینی
شینو شەپۆڕاو وێرانی ..
بەڵام ئازیز !
هەرچەن گڕە دانش هەناوو کویسانی
ئارۆ تینا
سەبای شەختەو یەخبەندانی ...
پێرەی خەندەو خونچەو ولا
وەشیو بەزمی هەرگیز نەمر

---

(٢) ژەرەژ : کەو . گوارەکێش : بەچکەکانی . دیا : سەیری کرد .
جه چەم بڕیا : لە چاو ون بوو .

بەخشۆ بە جیهانی وەڵا
سەرتەوە بـۆ
هەرچی دڕەی‌و پەیکوڵا
هەر بە ڕەگۆ هورشا پاچمێ
تێکەڵ بە شنەو سەرکەشا
جە سەرکەمەرە بەرزەکا
گۆرانی‌یە نەمرەکاما
دیسان ماچمێ .. هەر ماچمێ (٣) ..

---

(٣) ئەرامەندەن : داماوە . گرد جارێنە : هەموو بەجارێ . بدانێ بدەنە . ئەجیۆ : لـەوە ئەچێ . مـلو : بەسـەر . کەشـەکارە کەژەکانا . دانش : داویەتـە . ئـارۆ : ئەمـڕۆ . پـێرەی دووسبەی . دڕەی : دڕك : هۆرشا پاچمێ : هەڵیان‌ئەپاچین .

کورته چیرۆك :

# شـــوان

عەبدوللا عەزیز خالید

- ١ -

له دنیای کپی بێدەنگیـدا پێشم‌دەخـواردەوە ، هەموو شــتەکانی دەوروپشــتم لێ بـووە کارەســاتە ترســـناکەکانی ڕابـووردوو ، بـه سڵەمینەوەیەکی ساماناکو هۆشیارانەوە ڕووبەڕووی داهاتەکان دەبوومەوە .

وشه وەنەوشـەیی‌یەکانی فەلسـەفەی ژیان دەبوونه پـردی ئـەو کەندەڵانەی بەردەمم .

— ( کۆست کەوتن چۆکم پێ دانادات ) .

هەستو بیرە تیژەکانی دایکم ڕەهێڵەو لێزمەی بارانێـکی بەخوڕی بەسەرمدا دادەباراند ، هاندەری بڕینی ئەو ڕێگا خوێنـاوی‌یەی دوورەی پێشــم بوو .

له بەخۆداچوونەوەیەکی هێمنانەی ئـەو تەمەنه بـەزایەچـووەی پێشووم بەسەر هاتی ( شـوان )ەی سـاواو لاپـەڕە ڕەش‌کـراوەکـانی مێژووی هێنایەوە یادم :

— « نەمهێشتوە تائێستا بێزاری بێتە میوانی هێلانەی خۆاسـتەکانمو

ماندوبوونو شەکەتی ڕێگا تامەزرۆیی لەخامۆشی‌دا بشکێنێ » .

لە ڕووباری ئەو هاتو بردەدا لێوی وشـــەکانم بە نمـەی دلۆپـە ڕوونەکان تەڕ دەکـرد :

ــ « چاوەڕوانی ئازارێکی سەخت دەکەم ، لە لکەوقووچ هەڵواسینی هەلۆێستەکاندا دڵم لەخۆدانامێنێ » .

سەرهەڵدانی وەرزی ژانەکانم لە کزبـوونی ڕۆشـــنایی دیدەی (شوان) ەوە ئاسۆ پەمەیی‌یەکەی دەردەکەوت...دەست گرتنی (شوان)ەو گەیاندنی بە مەنزڵگای مەبەست لای من ئەوپەڕی ئاواتمی دەهێنایەدی .

شاخە قووچەکەو تەمومژە خەستەکەی بوارەکەی پێشم ئاخێلی پڕ لە ناسۆری‌و هەناسەیەکی قووڵی پڕ بە ناخی سی‌یەکانمی پێ هەڵمژیم .

ــ نەگبەت شـەیدای تێشـکی خـۆرێکی تۆراوی ، خـۆرەی هەموز تاریکی‌یەکیشـیت .

بە دەستم بوایە هەموو دنیای شەوەزەنگم ئەترنجاندە ناو تروسکایی گڵۆپێکی یەکجار بچووکەوە .

ــ ئێ بۆ دەستم نی‌یە .. بۆ ڕووەو گڵۆپەکان مل‌ئەنیم ؟.

ڕاستە هـــەر کە گـزنگی خـۆر دەرکەوت ورشەو درەوشـەی ئەستێرەکان کاڵ دەبنەوەو کاڵترو ئەنجام زایە دەبێت .

**ـ ٢ ـ**

لای خۆمەوە هەر بڕیاری بڕینی ڕێگا دوورەکەی بەردەمم دابوو ،

نە بەسەرهاتەکەی (شوان)ەو نە چاوڕاوی حوکمی بەفیـزی مێژوو یەك تۆز کـاری لای من نەبوو •

- ٣ -

شەوەزەنگێکی سامناكو نالەبار بوو ، تازە ڕووناکیی کارەبا کەوتبوە ناومانو لە دووکەڵو کزیی شەوقی چرا نەوتینەکە قوتار ببووین • تیشکی گڵۆپـەکان تاریکییـەکـەی دەورو پشـتی ڕاودەنـاو ڕاودەنـاو دەیڕەواندەوە • نەخێر ئەنجام بەوەشـەوە نەوەسـتا تـاریکییەکەی هەڵدەلووشی •

ساکارەکان تەنیا ئاشـنایەتییان لەگەڵ شـەوقی ڕووناکییەکـەدا هەبـوو ، لەوەبەولاوە هیچ شـارەزایییەکیتریان نەبـوو ئەوە نەبێ کارەبا ڕووناکی پەخشدەکاتو هیچیتر •••! کەچی بەپیرەوەچوونی ئەمجارەم بڕبیاکردنی چەپکە تیشکی : « خۆرو ڕووناکیی گڵوپو گڕی نەورۆزە » •

وروژاندنی بیرەوەرییەکانی هەراسـانییان بە کاسەی سـەرم هەڵگرتبوو •• تا دەهـات لێی نـزیكو نزیـكو نزیکتر دەبوومـەوە تـا دەگەیشتمە مەنزڵ • ئەوسا ئاهێکی جوامێرانەم هەڵدەمژی •

هەر ئەودەمە گەردولوولی نەهـاتی هەڵیکردو لەپڕ هاوارێـکی لەناکاو ڕایچڵەکاندم :

— فریایکـەون •

لە تەنیا یەك چرکەدا گڵۆپ کوژایەوە دەنگی (شوان)ە کپ بـوو •

دادو هاوارو گریانی دایکی (شوان)ە لاپەڕەیەکی‌تری مێژووی بێ ڕەش کرایەوەو بەگورجی بەڕێ کراو بۆ چەندەمین جار بە دەستی ئانقەست وێڵو سەرەونگوون کرا ! ...

لە دنیای واقیوڕماویدا تاس‌دەبردمەوە ، لە چاوەڕوانیی ئاکامێکی کورتدا وردە وردە دەهاتمەوە سەر خۆم تا هەڵسامە سەر پێ .

لەم سانەدا ناسکترین تەزووی هەستیکی تیژ پیشی پێ دەخواردمەوەو ئاڵوزی‌یەکی نالەباری کردە قەبەڵم ، پڕووکاندمی ، قاڵی‌کردم :

— کەسم خۆش‌ناوێت ، بە بینینی تیشکی ڕووناکی گلۆبەکان ڕقم ئەستوورو ئەستوورتر دەبوو ، بێزم لە گزنگی خۆریش دەبووەوە، شەیداو حەیرانی تاریکیش نەبووم .

— ئای کوڕینە چیم لێ بەسەرهات ؟ ... دنیایەکی پڕ لە سەمەرە تێ‌کەوتووین ، تاوان تاوانی هەمووانە ، کەچی شەیدایی پێ دەسەلماندم : ( تۆ تاوانبارنیت ) ! . .

عاشقی دیداری پەرستراوەکەمم ، خۆم حەیرانی تیشکی ڕووناکیم ، خۆم بڕیاری بڕینی ڕێگاکەم داوە .

گرو گڤی هەڵچووی حەزو ئارەزووە باوەکانی سەردەم لەگەڵ زادەی ناخی دەروونی ڕەسەنایەتیی هاواری دایکمدا نەدەگونجاو دەستیان دەنا بە خوێن‌و جەرگی یەکەوەو ئاکامیش بەدەم قوڵپێکی بەکوڵەوە یەقی‌دەکردەوە .

دوای نەمانی (شوان)ە خۆشیم بە هیچ ڕووناکی‌یەك نەدەهات .

دەنـگێ :

ــ هەڵەیت ( شوان )ە لەیادچوو •

دووبارە دەنگەکە !

ــ کەم فرسەتی ! ••

دیســان لەبەرخـۆمەوە ســەرکۆزەرەی وشەی کاوێژی خـاوەن هەڵویستەکانم دەکردەوە •

نەء لەبارنەچووە ••• کەمتەرخەمین ، تاوانبارین ! ••

دەنـگەکە :

ــ • • • • • • • •

من هەر لە دەریای بێسەروبنی ئەو بیرو ڕووداوە تاڵانەدا دەمردمو دەژیامەوە کە بەدەم ڕۆیشتنیەوە دڕم بە شەوەزەنـگەکە داو بێوچـان شەقمدەکردو بەپیر هاواری دەنگەکەوە دەچووم •

ــ خەڵکی چی دەڵین با بڵێن ، چی دەبێت با ببیت ، من خۆم خۆم دەناسم • بەدەم ڕۆیشتنو دوورینەوەی پەڵەی ئەو گوڵە گەنمانەی کەرویشـکەیـان دەکـردو دەڕۆیشتم ، زیاتر نـزیكو نـزیكتر دەبوومەوە •

# شیعری داغستانی‌و سۆلابیــان ستالیسکی

**محەمەد پەژار**

**کردوویە بە کوردی**

شیعری داغستانی بە چەند قۆناغێکی مێژوویی درێژدا تێپەڕیوەو بە ئەدەبی گەلانی دەورو پشتەوە وەکو شیعری تورکی‌و ڕووسی‌و عەرەبی ـ پێوەندیدار بووە •

شیعری داغستانی بە یەك زمان نانووسرێت ، بەڵکو بە چەند زمانێکی جۆربەجۆر • ئەم شیعرەی خــوارەوەش لــە زمــانی ( دەرغینی )یەوە وەرگیراوە کە شادەماری ڕێبازە شیعری‌یەکانە لە داغستانداو ، چێژی شیعری داغستانی‌و ڕێڕەوەکەی دەبەخشێ •

( سۆلابیان ستالیسکی )ی شاعیر ساڵی ١٨٦٩ی زاینی لەدایك بووەو ساڵی ١٩٣٧یش بۆ دوا جار چاوی لێك ناوە ، شیعرەکانی پڕن لە بەرامەی شۆڕش • ستالیسکی منداڵی‌یەکی تاڵ‌و ، دەست کورتی‌یەکی زۆری بــە خۆیــەوە بینیــوە • مەکسیم گــۆرکی لەبــارەیەوە دەڵێت ستالیســکی (هۆمیرۆس)ی سەدەی بیستەمە •

**نیشتمان ٠٠ نیشتمان ٠٠ ئەی لاو !**

دوژمن درۆو دەلەسەو فێڵ پێك‌دەهێنێ
بە هەزار ڕوو خۆی دەنوێنێ
جا هەمیشە وریا بە نەتخەڵەتێنێ
دوژمن گورجە بۆ گێڕانی پیلانی ڕەش
دڵی پڕیەتی لە کینە
جا چەکەکەت بپارێزە
هۆشیاربـە
دوژمن‌دارین‌و تاوانباریش نین
هۆشیاربـە
لە فرمێسکی دوژمن خۆت بپارێزە
دوژمن ڕاست ناکات
هەرچەند خۆیت بە کەڕو کوێر نیشان‌بدات
مەهێڵە دڵۆڤانی زاڵ بێت بەسەرتدا
سەدان دوژمن دانەگیرەت لێ دەکەن‌و
هاوڕێیشیان هەیـە
هۆشیاربـە
بۆ نیشتمان خزمەتکارو پاسەوان‌و دڵدار بە
با خەنجەرەکەت
هەردەم خوێنی دوژمنەکانتی لێ بتکێ
لەیادت‌نەچێ
ئەمەی کە ( سۆلابیان ستالیسکی ) دەیڵێ ٠

# ڕوونکردنەوەیەك

لە ئەندامی یەکێتیی نووسەرانی کورد ، لقی هەولێر ، کاك ئەنوەر مەسیفی‌یـەوە ڕوونکردنەوەیەکمان بـۆ هاتـوە بـۆ بڵاوکردنـەوە • ڕوونکردنەوەکە بە دڵێکی زۆر بریندارەوە نووسراوە ، لەبەرئەوە لەگەڵ داوای لێبووردندا لە کاك ئەنوەر ، لەجیاتیی بڵاوکردنەوەی تێکستەکەی ، پوختەی مەبەست بڵاوئەکەینەوەو دەنگمان ئەخەینە پاڵ دەنگی کە ئەبـێ دەسکاریی بیری شاعیرو نووسەر نەکرێو بەرهەمەکەی بۆ مەبەستی لە مەبەستی خاوەنەکەی بەدەر بەکارنەهێنرێ •

کاك ئەنوەر ئەڵێ لەمدواییەدا شیعرێکی لە ژمارە (٦٨)ی گۆڤاری (بەیان)دا دیوە بە ناوی خۆیەوە ، بە خوێندنەوەی زۆر ناڕەحەت بـوە چونکە :

(١) ئەو شیعرەی لە **١٩٧٧** دا نووسیوەو ناردوویە بۆ (بەیان) •

(٢) ئەو شیعرەی لە **١٩٧٨**دا لە کۆمەڵە شیعری ( خۆرباران )دا بڵاوکردوەتەوە •

کەچی لە گۆڤاری (بەیان)دا :

(١) ناوی گۆڕاوە •

(٢) لەجیاتیی ئەو بەدیاری پێشکەشیان کردوە بە گەلانی ئێران ، هەرچەند ئەو وەك خۆی دەڵێ بە دڵو گیان لەگەڵ خەبـاتی

گەلانی ئێراندایە ، بەڵام ئەو پێشکەش کردنە تەنهـا مافـی خۆیەتی •

(٣) مێژووی دانانەکەشی نەنووسراوە کە لەوانەیە بێ بەهۆی ئەوە خەڵك وابزانن سەرەڕای بڵاو کردنەوەی لە کۆمەڵە شیعرەکەیدا سەرلەنوێ ناردوویە بۆ گۆڤاری (بەیان) •

ئێمەیش بەش بەحاڵی خۆمان دووبارەی ئەکەینەوە مافی نووسەرانی ڕۆژنامەو گۆڤار ، پاش بڕیاردانی بڵاوکردنەوەی بەرهەم ، لە سنووری ڕاستکردنەوەی ڕێنووس و ڕێزمان تێناپەڕێ ، ئەگینا هەر ئەوەیان بۆ هەیە بەرهەمەکە بڵاونەکەنەوە •

( نووسەری کورد )

## داوای مافی خۆ کردنی ئەندامێکیش

لە ئەندامی یەکێتی (لە سلێمانی)، کاك جەمال محەمەد ئیسماعیلیشەوە، وێنەی نارەزایی نامەیەکمان پێ گەیشتوە کە بۆ بەڕێز بەڕێوەبەری گشتیی دەزگای کولتوورو بڵاوکردنەوەی کوردیی ناردوە نارەزاییی خۆی لەوە تێدا دەرئەبڕێ کە چەند مانگێك لەمەپێش کـۆمەڵە شیعرێکی بە ناوی (بناری ژوان)ەوە داوە بەو دەزگایە بە نیازی بڵاوکردنەوەیو ، کۆمەڵە شیعرەکەی دراوە بە خەبیر بۆ هەڵسەنگاندنی ، سەرەنجام لەمدواییەدا پێیان ڕاگەیاندوە کە شیعرەکانی بەپێی هەڵسەنگاندنی خەبیر پەسـەند نەکراوە لەلایەن ئەو دەزگایەوە بڵاوبکرێتەوە •

کاك جەمال لە نارەزاییی‌نامەکەیدا لەوە ئەپرسی کە ناتەواویی شیعرەکانی ـ بە رای خەبیر ـ لە چ‌روویەکەوەیەو ، بەلای ئەوەوە لەبەرچی شایانی بلاوکردنەوە نین‌و ، چۆن هەروا شیعرەکانی رەت‌کرانەوە بێ‌ئەوەی هۆی رەت‌کردنەوەیان باس‌بکرێ‌و بەو بووترێ ؟

ئێمەیش کە وا بەکورتی نارەزاییی‌نامەکەی ئەندامی بەرێزی یەکێتی کاك جەمال ئەخەینە روو ، بێ‌گومان نامانەوێ بلێین هەر کتێبی درا بە دەزگای رۆشنبیری بۆ بلاوکردنەوە ، ئەبێ بلاو بکرێتەوە ، بەلام خەبیریش کە کرا بە سەرپشك ، ئەبێ مافی هەردوو سەرەکە تەماشا بکاو لە بەرچاوی بێ‌و ، ئەبێ هۆیەکانی بریارەکەی پیشانی هەردوولا بدرێ ، تا هیچ نەبێ ئەم‌لاش بۆ بەرەوپێش‌بردنی خۆی کەلکیان لێ وەربگرێ .. سەرەرای ئەوە خۆ ئەگەر دەزگای ناوبراو توانای بلاوکردنەوەی بەرهەمێکی ، لەبەر هەر هۆیەك بوە ، نەبوو ، خۆ ئەتوانێ یارمەتیی خاوەن بەرهەمەکە بدا بۆ بلاوکردنەوەی بەرهەمەکەی .. ئاخر خۆ هەموان ئەزانین چۆن لەم‌رۆژانەدا مزی چاپ بوە بە ئاگرو دەستی بنووس‌و شاعیر ئەسووتێنێ‌و ، بوە بە دووپشك پێوەی ئەداو ، کەم‌کەس ماوە بتوانێ بە پارەی خۆی بەرهەمی لەچاپ‌بدا .

**( نووسەری کورد )**

صدر حديثا عن وزارة الثقافة والاعلام

## موسوعة المصطلح النقدي · الرومانسية

**تاليف جلن بير**

**ترجمة د· عبدالواحد لؤلؤة**

يتضمن الكتاب حلقة من سلسلة الدراسات القصيرة ، تعالج الواحدة منها مادة اساسية بمفردها او مادتين او ثلاث مواد مجتمعة ، مما يوجد في مفرداتها النقدية وتقديم المناقشات بشكل يتسم بالبساطة والوضـوح ·

**توزيع الدار الوطنية**
**للتوزيع والاعـلان / بغداد**

---

صدر حديثا عن وزارة الثقافة والاعلام

## مختارات من الاعمال الشعرية
## « لنجيب سرور »

يتضمن قصائد مختلفة مثل عهد العقاد ، والفارس والصليب · وبين يدى ابى العلاء ، وبصراحة وعتـاب ، وترنيمـة عن اسـد ، وكلمات غير متقاطعة وحفنتا دموع ، ومدينة العـذاب وغيرها مـن القصائد الاخرى ·

**توزيع الدار الوطنية**
**للتوزيع والاعـلان / بغداد**

# پێڕست

# خوێندەوارانی ئازیز !

ڕەنگە تیاتاندا هەبێ بڵێ : سەیرە ! قاقەزی ئەمجارەی گۆڤارەکە قاقەزی ڕۆژنامەیەو لەگەڵ ئەوەشدا نرخەکەی کراوە بە نیو دینار .. ڕەنگە تیایشتاندا هەبێ ، لەمەیش زیاتر ، ئەوەیشمان بۆ حسێب نەکا کەگۆڤارەکەمان ئەمجارە چواردە فۆرمەیەو لە هەموو ژمارە پێشووەکان گەورەترە .

ئێمە لە وەڵامی هەموو ئەم ڕەخنانەدا ئەڵێین باوەڕ بکەن لە ئێوە زیاتر حەزئەکەین گۆڤارەکەمان مانگ بە مانگ لەسەر قاقەزی سپی لەچاپ‌بدەین‌و بە صەد فلسیشی بفرۆشین ، بەڵام ڕووی نەبوونی ڕەش بێ‌و ، گلەیی لاتیی یەکێتی‌یەکەیشمان ، لە هەرکەس بکرێ ، لە ئێمە ناکرێ .. ئێمە هەر ئەوەندە ئەڵێین بەم حاڵەیش ئەگەر هەموو ژمارەکانی گۆڤارەکەیشمان بۆ بفرۆشرێ هێشتا دەیەکێکی مەسرەفەکەیمان بە زەرەر بۆ ئەمێنێتەوە .. هەر بەم‌حاڵەیشەوە ، پشت بە هیممەتی ئێوە بەتەماین ژمارەی‌تریشی بەدوادا بێ ..

« نووسەری کورد »

نرخی نیو دینار


لە کتێبخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارە ( ٢٤ )ی ساڵی ١٩٨١ی دراوەتێ

چاپخانەی ( الحوادث )
بەغدا - ١٩٨١